


# فەلسەفە لە مێژوودا
## (پوختەیەك)

ناوی کتێب: فەلسەفە لە مێژوودا
(پوختەیەک)
نووسینی: ئانفین ستیگن
وەرگێڕانی لە نەرویجییەوە: فەڕۆخ نێعمەتپوور
بابەت: فەلسەفە
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: بەختیار ئەورەحمان
هەڵەچنی: سارا عەبدوڵڵا
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نرخ: ٥٠٠٠
ژمارەی سپاردن: (١٠١٤)
چاپخانەی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپی: یەکەم ساڵی ٢٠٠٩
کوردستان - سلێمانی

www.serdam.net
www.serdam.info
www.serdam.org




# فەلسەفە لە مێژوودا
# (پوختەیەك)

نووسینی: ئانفین ستیگن
وەرگێڕانی لە نەرویجییەوە: فەڕۆخ نێعمەتپوور

**سلێمانی - ٢٠٠٩**




زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
کتێبی سەردەم ژمارە ()

سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی



# ناوەڕۆك

# پێشەکیی چاپی سێهەمی کتێبەکە بە زمانی نەرویجی

دوای مردنی (ئانفین ستیگن) لە ساڵی (1994) بەردەوام لە زانکۆ لە کتێبەکانی بەشی خوێندنی فەلسەفەدا گـۆڕان پێک هـاتووە و، بەپێی نیازی سـەردەم نوێ کراونەتەوەو شتی تازەیان پێ زیاد کراوە. بۆیە لە چاپی سێهەمی ئەم بەرهەمەدا ئەم پێویستیە لەبەرچاو گیراوە و هەوڵ دراوە کە گۆڕانی پێویستی تێدا رەچاو بکرێ کە ئەمانەن:. ئەو بەشانەی کە چیدی لە زانکۆ ناخوێندرێن، لە کتێبەکە وەدەرنراون.

- بەگوێرەی گۆڕانی کتێبەکان، بابەتی تازە بە بەرهەمە کە زیاد کراوە.
- هەندێک پەرەگراف بەگوێرەی گونجانی پتری ئەم بەرهەمە لەگەڵ کتێبەکانی زانکۆ، هەڵگیراون.

پێویستە دیسان لەسەر ئەوە پێ دابگرینەوە کە گۆڕانکاریەکان تەنیا لەم چوارچێوەیەدا ئەنجام دراون.

ئۆسلۆ و ترۆمسۆ، نۆڤێمبەری 1996

کۆلبین برێدە

پێتەر نافستاد



# پێشەکیی وەرگێڕ

وەک لە پێشەکیی چاپی سێهەم بە زمانی نەرویجیدا باسی لێکراوە، ئەم کتێبە تایبەتە بە خوێندکارانی بەشی فەلسەفە لە زانکۆکانی نۆرویژ. ئەم بەرهەمە لە بنەڕەتدا بەشێوەی پرسیار و وەڵام نووسراوە و نووسەر هەوڵ دەدا مودێلێک بۆ وەڵامدانەوەی پرسیار لە کاتی تاقیکردنەوەکانی زانکۆدا پێشکەش بە خوێندکاران بکا. هەربۆیە لە کۆتایی کتێبەکەدا چەندین وەڵامی خوێندکاران لە کاتی تاقیکردنەوەدا لەگەڵ نمرەکانیان (دەرەجە) هاتوون کە من خۆم لە وەرگێڕانیان بواردوە. هەڵبەت ئەمە هیچ لە ئاستی کتێبەکە کەم ناکاتەوەو خوێنەر بەبێ ئەوانیش دەتوانێ زانیاری پێویست و بەکەڵک لە بابەت ژمارەیەک لە فەیلەسووفە بەناوبانگەکانی جیهان وەربگرێ.



ئـەم بەرهەمە چەندین چاخی فەلسەفی لە خۆی دەگرێ و هەوڵ دەدا کە ناوەڕۆکی بیر و ئەندێشەی فەیلەسووفەکانی ئـەم سـەردەمـانـە بـەکورتـی و بەشێوەیەکی پوخت بخاتە بەردەست خوێنەرانی. وەک دەبیندرێ کتێبەکە باس لە هەندێک فەیلەسووفی گرنگی دیکە بەتایبەت سەردەمی ئیستا ناکات و تێیاندەپەڕێنێت. ڕەنگە مـەودای نووسینێکی لەم چەشنە دەرفەتی ئەوە نـەدات کە نووسەر هەموو فەیلەسووف و بیریاران بـەسـەربکاتـەوە. بـەڵام بەهەرحاڵ ئـەم بەرهەمە دەتـوانـێ بـەش بە حاڵی خۆی سوودمەند بێت و دەلاقەیەک بێت بە رووی گرنگترین چەمکەکانی فەلسەفەدا.
ئەم نووسینە لە دەیـەی نـەوەدی سـەدەی بیستەم بەرهەم هێنراوەو بێ گومان ئیستاکە لە چاو ئەو کاتە گۆڕانـی گـەورە بەسەر شـێوازی کتێبەکانی بەشی فەلسەفە لە زانکۆکانی نـۆرویـێژدا هاتووە، بەڵام بەهەرحاڵ ئەم بەرهەمە دەتوانێ لە جێگای خـۆی بەسوود و بەکەڵک بێت و سـەرەتایەک لە بیری فەیلەسووفە گرنگەکان پێشکەش بە خوێنەران و هۆگرانی فەلسەفە بکات.

04.05.2008

## تایبەتمەندییەکانی دابڕان لە بیری میتولۆژی1 لە یۆنانی کۆندا کامانەن؟ فەیلەسووفەکان لەم بوارەدا لەگەڵ چ کێشەگەلێک رووبەڕوو بوون؟

1. لە دەوروبەری ساڵی (600)ی پێش زایینەوە بەرەبەرە بیرمەندان و لێکۆڵەرەوان لە ناوچە یۆنانی زبانەکان سەرهەڵدەدەن، بۆ وێنە خودی یۆنان، کەنارەکانی ئاسیای بچووک و کۆڵۆنیەکانی یۆنان لە باشووری ئیتالیا. ئەم بیرمەند و لێکۆڵەرەوانە کە دواتر ناوی فەیلەسووفیان لێنرا، زیاتر لە هەر شتێکی دیکە سەرقاڵی هۆ یاخود هۆیەکان لە سروشتدا بوون. واتە ئەو هۆیانەی دەیانتوانی بنەمای رووداوو و دیاردەکانی ناو سروشت بخەنە روو و دەستنیشانیان بکەن. ئەوان بە شوێن هۆکارە سروشتییەکاندا دەگەڕان و لە راستیدا وازیان لە هۆکارە بانسروشتیەکانی وەک خودا و میتولۆژیا هێنابوو. شیکردنەوەکانیان پشت ئەستور بوو بە شتە

هەستپێکراوەکان، واتە ئەو شتانەی مرۆڤ دەیتوانی لە ڕێگای هەستەکانەوە پەیوەندیان لەگەڵ بەرقەرار بکا. شایانی گوتنە کە زۆربەی فەیلەسووفەکان تەنیا بە فەلسەفەوە سەرقاڵ نەبوون، بەڵکو ماتماتیک، ئەستێرەناسی و سروشتناسی بوارەکانی دیکەی کار و ماندووبوونی وان بوون. لەراستیدا تا سەدەی 18 بە هەر چەشنە زانست و سروشت ـ زانیارییەک2 دەگوترا فەلسەفەی سروشت. بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بە جووڵە ـ یاسای نیۆتۆن بکەین کە پێی دەگوترا فەلسەفەی سروشت.

فەیلەسووفەکانی پێش سوفیستەکان بە دوو کێشەی سەرەکییەوە سەرقاڵ بوون: 1ـ کێشەی "بن مەتریاڵ"3 واتە ئەو مەتریاڵەی هەموو مەتریاڵەکانی دیکە لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە. 2ـ کێشەی جووڵە و گۆڕان.

**کێشەی بن مەتریاڵ: ئایا مەتریالێکی سەرەکی هەیە کە هەموو مەتریالەکانی دیکە لەوەوە سەرچاوەیان گرتبێ؟ ئەمڕۆکە ئەم پرسیارە بەم شێوەیە ئاراستە دەکرێ: ئایا لە بنەڕەتدا شتێك هەبووە کە شتەکانی دی بەرهەمی گەشەی ئەو شتە بنەڕەتییە بن؟ داخۆ دەتوانین یەك یان چەند بن مەتریالێك دەستنیشان بکەین کە مەتریالەکانی دی لەوانەوە پێك هاتبن؟**

لە وەڵامی ئەم پرسیارانەدا «تالس» یەکەمین فەیلەسووفی جیهان دەڵێ کە ئاو بنمەتریالە و هێراکلیتیش دەڵێ ئاگر.

**کێشەی گۆڕان و جووڵەش دوو پرسیار لە خۆ دەگرێ: ئایا جووڵە و گۆڕان راستەقینەن؟ چ جۆرە شتێك دەگۆڕدرێ و چ جۆرە شتێك ناگۆڕدرێ؟**

لە وەڵامی ئەم پرسیارانەدا سێ بیروڕای سەرەکی هەیە: ١) فەیلەسووفی ئیلیایی پارمەنیدێس دەڵێ کە هیچ شتێک ناگۆڕدرێ. ٢) هێراکلیت دەڵێ کە هەموو شتێک لە گۆڕاندایە. ٣) ئەتۆمیستەکان دەڵێن ئەتۆم کە پێکهێنەری شتەکانن ناگۆڕدرێن، بەڵام شتەکان کە لە ئەتۆم پێک هاتوون، دەگۆڕدرێن.
دەبێ بڵێین کە پلاتۆن وەک پارمەنیدێس بیری دەکردەوەو ئەرەستوش وەک هێراکلیت. پلاتۆن دەیگوت کە تەنیا «ئایدیا» راستەقینە و نەگۆڕە و، ئەرەستۆش دەیگوت ئەم جیهانەی ئێمە لە رێگای هەستەکانمانەوە پەیوەندی لەگەڵ دەگرین، راستەقینەیە و بەردەوام لە گۆڕاندایە.
پارمەنیدێس وەک وتمان دەڵێ گۆڕان ناموکینە. دەلیلیشی ئەوەیە کە هیچ شتێک ناتوانێ لە شتێکەوە بێتە بوون کە بوونی نییە، یان هەر شتێک کە بوونی

هەیە ناتوانێت ببێ بە هیچ. زێنۆن کە قوتابیی پارمەنیدێس بوو بە هێنانە گۆڕی کۆمەڵێک پارادۆکس لە بابەت ئەم وتەزایە دەیویست ئەوە نیشان بدات کە گۆڕان واتایەکی بێ مانایە.

هێراکلیت دوو بۆچوون دەهێنێتە ئاراوە: ١) شتەکان لە جیهانی هەستپێکراو و مەتریالیدا بەردەوام لە گۆڕاندان. ٢) بەڵام بۆئەوەی بتوانین گۆڕان بسەلمێنین دەبێ کۆمەڵێک پێوەر، وتەزا و تاریفی دیاریکراو هەبن کە بۆ خۆیان نەگۆڕ بن. لەم پەیوەندییەدا مرۆ دەتوانێ سەرنجی ئەم وتەیەی ئەرەستو بدات کە دەڵێ جیهانی هەستپێکراو لە گۆڕاندایە، بەڵام کۆمەڵێک تایبەتمەندیی نەگۆڕیش هەن.

ئەتۆمیستەکان دەڵێن کاتێک ئێمە شتێک بەسەر خۆیدا دابەش بکەین، سەرئەنجام دەگەینە شوێنێک کە ئیدی ناتوانین لەوە زیاتر ئەو شتە دابەش بکەین. ئەوان دەیانگوت کە ئەم توخمە هەرە بچووک و نەگۆڕە ناوی «ئەتۆم»ە و لەڕاستیدا هەموو شتەکانی جیهان لەوان پێکهاتوون. هۆی ئەوەی ئەتۆمەکان لەوە زیاتر دابەش ناکرێن ئەوەیە کە وەها لە ماددە تۆکمە و تێئاخنراون، کە چیدی دەرفەتی دابەشبوون نادەن. هەروەها ئەتۆمەکان بەهۆی بچووکیی لەرادەبەدەریانەوە هەست پێناکرێن، بەڵام بە عەقڵ دەرکیان پێدەکرێ. ئەوەی کە شتە هەستپێکراوەکانیش جۆراوجۆرەن، هۆکارەکەی ئەوەیە کە لە ئەتۆمی جۆراوجۆر پێکهاتوون. لەڕاستیدا ئەتۆمەکان دەتوانن

فۆڕم و قەوارەی جۆراوجۆریان هەبێ، هەروەها کێش و جووڵەی جۆراوجۆریش.

بەپێی بۆچوونی ئەتومیستەکان، جیهان لە ئەتۆمەکان پێکهاتووە. هەرچی لە سروشتدا روودەدات ئاکامی لێکگرێدان و لێکپچڕانی ئەتۆمەکانە. ئەتۆمەکان بەشێوەی میکانیکی لەسەر یەک کاریگەرییان هەیە. بە وەها بۆچوونێک دەگوترێ «تێگەیشتنی میکانیکیانەی سروشت». بەگوێرەی ئەم بۆچوونە جیهان وەک ماشین کاردەکا. واقعییەت جگە لە تایبەتمەندیی ئەتۆمەکان شتێکی دیکە نییە. هەربۆیە واقعییەت بێ رەنگ، بۆن، تام، دەنگ و گەرمایە.

## ئەو روانگانەی سوفیستەکان هێنایانە ناو فەلسەفەوە چ بوون؟ تایبەتمەندیی کاری سوقرات لە چدا بوو و بە چ پرسیارگەلێکەوە سەرقاڵ بوو؟

1 ـ یەکەم سوفیستەکان لە دەوروبەری ساڵی (450)ی پێش زایینەوە لە یۆنان سەریان هەڵدا. بیروبۆچوونی وان لەراستیدا کاردانەوەیەک بوو لەبەرامبەر فەیلەسووفە سروشتگەراکاندا، ئەوانەی بۆ وێنە دەیانگوت هەموو شتێک لە ئاو یاخود لە

ئاگرەوە سەرچاوەی گرتووە. هەروەها ئەوان دژی بیروبۆچوونی ئەتۆمیستەکانیش بوون. سوفیستەکان سەرنجیان لە جیهانی دەرەوە بۆ ناوەوە قۆستەوە، واتە بۆ مرۆڤ و کیشەکانی. بۆ وێنە بۆ سروشتی مرۆڤ، تواناییەکان و ئاکار و کرداری. هەڵبەت دواتر سوقرات، ئەفلاتوون و ئەرستوش لە بابەت ئەم کێشانەوە دووان.

2 ـ سوفیستەکان گەڕۆک بوون و لەبەرامبەر وانەگوتنەوەدا پارەیان دەستاند. کە ئەمە لەراستیدا پێچەوانەی ئەو ناوەی بوو کە لە خۆیانیان نابوو. چونکە ئەمە دەبووە هۆی ئەوەی ئەوەندەی سەرنجیان دەدایە حەز و خواستی گوێگرەکانیان، سەرنجیان نەدەدایە کێشە گرنگەکان. فەیلەسووفەکان ئەم جیاوازییەیان بەم شێوەیە پێناسە کردووە: فەیلەسووف بە واتای کەسێکە کە بە شوێن زانایی و حیکمەتدا دەگەڕێ و سوفیستیش بە واتای کەسێکە کە خاوەنی زانایی و حیکمەتە. ئەفلاتوونیش ئەم جیاوازییەی بەم شێوەیە پێناسە کردووە: سوفیست وەک ئاشپەز وایە کە چێشتی خۆش و بەتام بۆ خەڵکی ساز دەکا، بەڵام فەیلەسووف پزیشکێکە کە تەندروستی و سەلامەتی دەبەخشێ.

3 ـ پێویستە لێرەدا باس لە دوو سوفیست بکەین: پروتاگوراس و جورجیاس. پروتاگوراس پتر بەم

رستەیەوە دەناسرێتەوەو بەناوبانگە: "مرۆڤ پێوانەی هەموو شتێکە"، بەڵام روون نییە کە مەبەستی لەم رستەیە چیە. جورجیاش بەناوبانگترین سوفیستی سەردەمی ئەفلاتوونە. مرۆڤێکی زیرەک و دەوڵەمەند بوو. ئەویش لەو بابەتەوە بەناوبانگە کە پێی وابوو ناسین بەگشتی بۆ مرۆڤ دەست نادا.

4ـ لە دوا وشەدا سوقراتیش وەک سوفیست حسێبی لەسەر دەکرێ. ئەویش دەگەڕا و لەگەڵ هەرکەس کە دەستی دابا، سەری گفتوگۆی دەکردەوە. حەزی بە دیالۆگ بوو و بە ئاراستەکردنی پرسیار، زەینی بەرامبەرەکەی دەوروژاند. بەڵام وەها نەبوو کە وەک مامۆستا وانە بڵێتەوە، بۆچوونەکانی بنووسێتەوەو پارە وەربگرێ. هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە پێی وابوو هیچ نازانێ! لای وی گەڕان بە شوێن حەقیقەت لە خاوەنداریەتی حەقیقەت گرنگتر بوو. هێنانەگۆڕی کێشە فەلسەفیەکان لای وی، لە دوا وەڵامدانەوە گرنگتر بوو.

5ـ سوقرات شێوەی خۆی لە گفتوگۆکاندا ناو نابوو "هونەری مامایەتی". واتە ئەو تەنها یارمەتی لە دایکبوونی کۆرپەی بیری دەدا. گرنگترین شت لای وی ئەوە بوو کە خەڵکی بخاتە بیرکردنەوەو یارمەتیی ئەوەشیان بدا هەر بۆ خۆیان بگەنە وەڵام. بنەمای میتۆدی ئەو بەم چەشنە بوو کە پرسیار ئاراستەی

خەڵکی بکا، بێ ئەوەی فێریان بکا. لێرەدا کەڵکی لە ئیرۆنی Irony وەردەگرت. واتە وای نیشان دەدا کە نازانێ، بەڵام لەراستیشدا گەلێک شتی دەزانی.

6 ـ لەراستیدا دەبێ لەمە واتێبگەین کە سوقرات پێی وابوو، یان زۆر کەم دەزانێ یان هەر هیچ نازانێ. شورای دلفی Delfi دەیانگوت سوقرات زاناترینی مرۆڤەکانە. سوقراتیش دەیگوت زانایی ئەو لەوەدایە کە بەپێچەوانەی خەڵکانی دی دەزانێ کە نازانێ!

7 ـ سوقرات لە کاتی گفتوگۆدا زۆربەی کات بە چەمکە گرنگەکانی ئێتیکەوە دەستی پێدەکرد (بۆ وێنە چەمکگەلی وەک عەداڵەت و ئازایەتی). هەوڵی دەدا هەندێک پێناسەی تەواو و پێویست لە بابەت ئەم چەمکانەوە بەدەستەوە بدات. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە پێی وابوو ئەوەی راستی دەزانێ، بەشێوەیەکی راستیش هەڵسوکەوت دەکا، وە ئەوەی نازانێ راستی چیە، نازانێ بەشێوەیەکی راستیش هەڵسوکەوت بکا. بڕوادار بوون بە عەقڵ و زانایی تایبەتمەندیی سوقرات بوو. بێ هۆ نەبوو کە شورای دلفی دەیانگوت زاناترینی مرۆڤەکانە. هەروەها هەر ئەم تایبەتمەندییە بنەمای ئەم رستە بەناوبانگەی سوقرات بوو کە دەیگوت: "خۆت بناسە!".

8 ـ لای سوقرات ژیان و فێربوون پێکەوە گرێ

درابوون. ژیان و فێربوون تەواوکەری یەکتر بوون. لێرەدا کاتی ئەوەیە هەندێک لە رووداوە گرنگەکانی ژیانی سوقرات بەسەر بکەینەوە: سوقرات تەواوی ژیانی لە ئاتێن بەسەر برد، لەگەڵ خانتیپە Xantippe ژیانی هاوبەشی دامەزراند، لە بابەت ئەوەو شکاتی لێکرا کە بە دژی خواکان پروپاگەندە دەکا و گەنجەکان لە رێ بەدەر دەکا، لە کۆتاییشدا هەر بەم بیانووەوە سزای مەرگی بەسەردا سەپێنراو جامی ژەهریان دەرخوارد دا. وەک گوترا سوقرات هیچ نووسراوەیەکی لێ بەجێ نەما، بەڵام ئەفلاتوون لە نووسینەکانی خۆیدا گەلێک باسی سوقرات دەکا، وەها کە گەلێک ئەستەمە بزانین ئەوەی ئەفلاتوون نووسیویەتی، بیروبۆچوونی خۆیەتی یان خود سوقرات.

---

1- mytologisk tenkning
2-naturviten
3- urstoff

**هەبەستی ئەفلاتوون لە ئایدیا چ بوو؟ لای ئەو چ شتێك فۆڕمی زانستی لە فۆڕمی ناسینەکانی دی جیا دەکردەوە؟ بەرای ئەفلاتوون مرۆ لە چ بوارگەلێکدا دەتوانێ زانستی هەبێ؟ بۆ شیکردنەوەی باشتر کەڵك لە سێ وێناکەی ئەفلاتوون وەربگرە!**

1) بنەمای مەعریفەی ئایدیا بەقەدەر خودی مەعریفە گرنگی هەیە. بیرۆکەکە ئەوەیە کە زانست (واتە ئەوەی ئێمە دەڵێین دەیزانین) نەبزاوت و نەگۆڕە، بەڵام ئەوەی ئێمە لە رێگای هەستەکانمانەوە دەیانناسین (واتە تەواوی ئەو شتانەی بەر هەست دەکەون) بگۆڕن. بەڵام بەهەرحاڵ ئەوە راستییەکە کە ئێمە زانستمان هەیە، بۆ وێنە زانستی ماتماتیک. زانست دەبێ ئەو شتە نەگۆڕانە بگرێتە خۆ کە لە جیهانی هەستپێنەکراودا پەیدا دەبن. کە ئەم جیهانە هەست پێنەکراوەش (واتە ئەو جیهانەی ناکەوێتە بەرهەست) جیهانی ئایدیاکانە. ئەو ئایدیایانەی هەر کامیان نموونەیەکی سەرەکین کە شتە هەستپێکراوەکانیان لە رووەوە دروست دەبێ (بۆ نموونە هەموو ئەو مرۆڤانەی هەست پێدەکرێن، لە ئایدیای مرۆڤەوە هەڵقوولاون. ئەو ئایدیایەی تەنیا بە فکر پەی پێ دەبەین).

2) ئاکامی ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە مرۆ دەتوانێ تەنیا لەسەر شتە نەگۆڕەکان زانستی هەبێ، جا چ سەبارەت بە ماتماتیک بن، یان ئایدیا ئەفلاتوونیەکان. شتەکانی دی کە ئێمە ناسینمان لەسەریان هەیە، وەهم و گومانن، جا چ وێنەیەک بن لە بەرهەستەکان یان خودی بەرهەستەکان.

3) بەهۆی ئەوەوە کە ئەفلاتوون جیاوازی دادەنێ لەنێوان زانستی ماتماتیک و زانست لەمەڕ ئایدیاکان، هەروەها لەنێوان ئەو زانیاریانەی مرۆ لە ڕێگای وێنەوە بەدەستیان دێنێ لەگەڵ ئەو زانیایانەی لە ڕێگای هەستی ڕاستەوخۆوە وەچنگ دەکەون، ناسین بەسەر چوار ئاستدا دابەش دەکا، کە هەر کامیان نیشاندەری چوار پلە لە حەقیقەتن.

4) ئەم چوار ئاستە لە "وێنا هێڵ" دا باسیان کراوە. لەم وێنایەدا ئەفلاتوون بە چوار قۆناغدا تێدەپەڕێ، کە یەکەم قۆناغ لە خوارەوە دەست پێدەکا تا دەگاتە چوارەمین کە لەسەرەوەی هێڵەکەدایە. قۆناغەکان بەم شێوازەن: 1 ـ قۆناغی وەهم. 2 ـ تێگەیشتن 3 ـ تێگەیشتنی زیاتر 4 ـ ئاوەزک یاخود تێگەیشتنی تەواو. هەر کام لەم قۆناغانە زانیاریمان لەسەر ئەم شتانە پێدەدەن: 1 ـ وەهم وێنەیەک لە شتە بەرهەستەکان 2ـ تێگەیشتن بریتیە لە دەرکی ئەو شتانەی لە جیهانی هەستدان 3 ـ قۆناغی تێگەیشتنی زیاتر، مرۆ دەگەیەنێتە ئاستی وشە و دەستەواژە،

بۆ وێنە وشەگەلی سێگۆشە و جەغز لە ماتماتیکدا 4 - لە قۆناغی ئاوەزیشدا مرۆ دەگاتە ئایدیاکان. وەک دەبینین پیَ بە پێی بڕینی قۆناغی وەهم بەرەو ئاوەز، ناسین روونیەکی زیاتر پەیدا دەکا، هەروەها بەم پێیە پلەی حەقیقەتیش لە وێنەوە بەرەو ئایدیا بەرز دەبێتەوە.

5) کلیدی ئەوەی بۆچی ناسین، تێگەیشتن و حەقیقەت بەگوێرەی بڕینی پلەکان زیاد دەکا، لەوەدایە کە هەر کام لە پلەکانی خـوارەوەی وێنا هێڵەکە، لە پلەی سەرەوەی خۆیان دەچن. هەر وێنەیەک لە مرۆڤێکی دیاریکراو، کۆپیەک یاخود وێنەیەکی لێکچووە لە خودی مرۆڤەکە. هەر مرۆڤێکیش بە نۆرەی خۆی کۆپیەکە لە وشە، یاخود دەسـتـەواژەی مرۆڤ کە ئەمیش دیـسـان بیچمی خـۆی لـە ئایدیای مـرۆڤ وەردەگریَ. گەر کورتی بکەینەوە ئاوای لێدیَ:

ئایدیای مرۆڤ <ـــ وشەی مرۆڤ <ـــ مرۆڤ <ـــ وێنەی مرۆڤ

6) ئەفلاتوون هەوڵ دەدا لە وێنایەکی دیکەدا ئەوە نیشان بدات کە چۆن مرۆ دەتوانیَ پلەکانی ناسین ببڕیَ. ئەم وێنا نوێیەش بریتیە لە "وێنائەشکەوت" لێرەدا بەرەورووی کۆمەڵێک مرۆ دەبینەوە کە لەناو ئەشکەوتێکدا یەخسیر کراون، کە ئەمە نیشاندەری

بارودۆخی ئێمەیە لە جیهانی هەستدا. ئەو جیهانەی ئێمە سەرەتا پێمان وایە تەنیا حەقیقەتی بەرزی جیهانە، بەڵام دواتر تێدەگەین کە تەنیا سێبەرێک بووە لە جیهانی حەقیقەت، واتە ئایدیاکان. هۆکاری ئەوەی ئێمە پێمان وایە سێبەرەکان تەنیا حەقیقەتەکانی جیهانن ئەوەیە کە ئێمە جگە لە سێبەرەکان شتی دیکەمان نەبینیوە.

7) سێهەمین وێنای ئەفلاتوون "وێناهەتاوە". ئەم وێنایەش باس لە پەیوەندیی نێوان پلە جۆراوجۆرەکانی نێوان ناسین و حەقیقەت دەکا، بەڵام تێیدا خوارترین پلە، واتە پلەی وێنە فەرامۆش کراوە. واتە لێرەدا تەنیا باس لە بەرهەستەکان، دەستەواژە و ئایدیاکانە. وێنای هەتاو دەیەوێ ئەوەمان نیشان بدات کە تێگەیشتنی ئێمە لە جیهان بە بوونی ئایدیاکانەوە بەستراونەتەوە. لێرەدا ئەفلاتوون ئایدیا بە هەتاو دەشوبهێنێ، شتە بەرهەستەکان بە رەنگ و تێگەیشتنی ئێمەش بە ئەزموونکردنی رەنگەکان. بە رای وی گەر هەتاو نەبا نە مرۆ دەیتوانی رەنگەکان ببینێ و نە شتەکانیش رەنگیان دەبوو. ئەفلاتوون دەیەوێ بەم شێوەیە نیشانمان بدات کە بە بێ بوونی ئایدیاکان نە جیهانی شتەکان لەئارادا دەبوون و نە ئێمە دەمانتوانی تەسەورمان یاخود تێگەیشتنمان لەسەریان هەبێ.




## روانینی ئەفلاتوون بۆ رۆح و پەیوەندیی رۆح لەگەڵ جەستە، چۆنیەتی پەیوەندی ئەم باسە لەگەڵ "خەسڵەتی پڕبایدار"1 و لەگەڵ مرۆ وەك بوونەوەرێکی ئاکارگەرا. یۆتۆپیای ئەفلاتوون و رۆڵ و دۆخی ژن لەنێویدا.

1ـ با سەرەتا کەمێک سەبارەت بە رۆح لە زمانی فەلسەفەدا بدوێین. رۆح لە زمانی فەلسەفەدا جیاوازە لە رۆح لە زمانی رۆژانەدا. لە زمانی فەلسەفەدا تەنها مرۆ خاوەنی رۆحە. لە زەمانی کۆن وا بیر دەکرایەوە کە هەموو ئەو شتانەی زیندوون (وەک گیا، ئاژەڵ و مرۆ) خاوەنی رۆحن. وەک دەزانین تواناگەلی وەک هەست و بیرکردنەوە جۆرێک وشیاری دەبەخشن، جا لێرەوە بیر لەوە دەکرایەوە کە لە پەیوەندیی نێوان رۆح و جەستەدا توانا رۆحیەکانی وەک (هەستکردن و بیرکردنەوە) بە جەستەوە بەستراونەتەوەهک یاخود جیاوازن و سەربەستن؟

2. بەپێی ئەم دابەشکردنە کە ناسین یاخود وشیاری دەکا بە دوو بەشەوە (هەست کە وشیاری سەبارەت بە دنیای هەستپێکراو دەخوڵقێنێ و بیر کە وشیاریمان لە بابەت دنیای ئایدیاکانەوە پێشکەش دەکا)، ئەفلاتوونیش رۆح بە دوو بەش دابەش دەکا: بەشی نزمتر کە جێگای هەست و مەیلەکانە و بەشی بەرزتر کە جێگای عەقڵە. بەشە نزمەکە بە جەستەوە گرێ دراوە و بەشە بەرزەکە سەربەخۆیە لە جەستە.

3. بۆ ئەفلاتوون عەقڵ گرنگتر بوو، چونکە عەقڵ بە بۆچوونی ئەو بە جەستەوە گرێ نەدراوە و هەربۆیە لەگەڵ جەستە نامری و لەناو ناچێ. ئەو پێی وابوو لەدوای مەرگ رۆح دەچێتە جەستەی دیکەوە، بەڵام هەتا رۆح بە جەستەوە گرێ درابێ ناتوانێ خاوەنی تێفکرینی روون بێت. هەر بۆیە ئامانجی فەیلەسووفەکان جیاکردنەوەی رۆح و جەستەیە. واتە سەرەتا دەبێ رۆح بە حاڵەتی سروشتی خۆی بگا بۆئەوەی بتوانێ حەقیقەت بناسێ (ئەگۆستین لەژێر سریمەی ئەم بۆچوونەدابوو. بە بۆچوونی وی ژیانی مرۆیەکی مەسیحی بە دوورە لە هەست و مەیل، ئەرەستوش دژی ئەم بۆچوونە بوو. ئەو پێی وابوو کە مرۆ یەکەیەکی پێکهاتوو لە رۆح و جەستەیە. ئەم یەکەیە لێک جیا ناکرێتەوە).

4. مرۆ وەک بوونەوەرێکی چالاک دەبێ لەنێوان ئەم دوو بەشەدا هەڵبژێرێ: جا یاخود عەقڵ هەڵدەبژێرێ یان هەست و مەیل (حەز). ئەوەی کە کردەی هەڵبژاردن ئەنجام دەدا ویستە کە بەشێکە لە رۆح. شوێنی ویست لەنێوان مەیل (حەز) و عەقڵدایە، کەواتە لەراستیدا سێ بەش لە گۆڕێدایە: عەقڵ، ویست و مەیل (حەز).

5. بەپێی ئەفلاتوون کاتێک رۆح لە جەستە دادەبڕێ ئیتر دەتوانێ زانست و زانیاری لەسەر هەموو شتێک پەیدا بکا، بەڵام کاتێک لەگەڵ جەستەدایە ئەم توانایە لەدەست دەدا. هەڵبەت نەک سەداسەد، چونکە لەم کاتەشدا دەتوانێ لە رێگای وەبیرهێنانەوەی ئایدیاکانەوە زانست و زانیاری دەستەبەر بکات.

6. سەبارەت بە ئاکاریش ئەفلاتوون پێی وایە بۆئەوەی بڕیارێک لە باری ئەخلاقییەوە دروست بێت دەبێ ئەو سێ بەشە بە جوانی پێکەوە هاوکاری و هاوئاهەنگیان هەبێت. ئەمەش زەمانێک دەکرێ کە هەر کام لەم بەشانە بە باشترین شێوە ئەرکی خۆیان راپەڕێنن. هەر بەشە دەبێ خەسڵەتە ئایدیاییەکانی خۆیان تا ئەوپەڕ بنوێنن. کە مەبەست لە خەسڵەتە ئایدیاییەکان هەمان "خەسڵەتە پڕباییدارەکانە". ئەم خەسڵەتانە دەبنە هۆی ئەوەی ئەگەر ئەرکێک راپەرێ،

ئەوا بە شیاوترین شێوەی گونجاوی خۆی ڕاپەڕێ (بۆ وێنە دەتوانین بڵێین کە چەقۆ دەبێ تیژ بێت بۆئەوەی بتوانێ بۆ ئەو مەبەستەی بۆی خوڵقێنراوە، بەکار بهێنرێ. تیژیەتی خەسڵەتی پڕبایبداری چەقۆیە). بەشێوەیەکی کۆنکرێتی دەتوانین بڵێین: 1- بیرکردنەوە خاوەنی عەقڵە. 2- ویست خاوەنی جورئەتە (بۆئەوەی بتوانێ پێ لەسەر ئەو شتەی دابگرێ کە بیر پێی گەیشتووە) 3- مەیلیش (حەز) ئارامی و میانەڕەوی دەنوێنێ. ئەمانە هەموویان پێکەوە لە کردەیەکی هاوئاهەنگدا دەتوانن ئەو گرنتیە ببەخش بە کردەیەک بۆئەوەی لە باری ئاکارییەوە دروست بێت. (هاوکاری و هاوئاهەنگی نێوان ئەم بەشانە دەتوانێ گرێ بدرێ بە تەندروستییەوە کە لە یۆنانی کۆندا باسی لێکراوە. مەبەست لە تەندروستی لای ئەوان بریتی بووە لەوەی کە هەموو بەشەکانی لەش و ڕۆح وەک یەک گرنگیان پێ بدرێ. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆ وەک یەکەیەک یا خود ئۆرگانیسمێک بە باشترین شێوە چالاک بێت).

7- ئەفلاتوون لە بەشێکی بەرچاوی نووسینەکانیدا باس لە پرسی دەوڵەت و کۆمەڵگا دەکا. لە کتێبی "دەوڵەت" دا وێنەیەکی ورد لە یۆتۆپیامان پێشکەش دەکا. هەڵبەت هێشتا ئەوە روون نییە کە ئەفلاتوون پێی وابوو ئەم یۆتۆپیایە دەتوانرێ بەدی بهێنرێ یان نا.

8. دەبێ کۆمەڵگا لە چەند چین و توێژ پێک هاتبێ بۆئەوەی بتوانێ وەکو دەوڵەتێکی شیاو خۆی بنوێنێ؟ بەگوێرەی ئەفلاتوون کۆمەڵگا دەبێ لەم سێ چینە پێک بێت: 1. بەرهەمهێنەران واتە جووتیاران، کرێکاران، ماسیگرەکان، بازرگانەکان و خزمەتکاران. 2. رابەران و پارێزەران، واتە ئەوانەی وا بڕیاری سیاسی و یاسایی دەردەکەن. 3. بەرگریکەران و یاریدەران، ئەوانەی وا یارمەتی رابەران دەدەن لەپێناوی چەسپاندن و راپەڕاندنی یاسا و بڕیارەکاندا، هەروەها ئەوانەی وا ئاسایشی ناوخۆی وڵات دەپارێزن و لەبەرامبەر هێرشی دەرەکیدا پارێزگاری لە وڵات دەکەن.

9. کەواتە دەوڵەت پێویستی بە سێ بەشە (هەر وەک چۆن رۆح خاوەنی سێ بەش بوو): 1. رابەران و پارێزەران. 2. یاریدەران و بەرگریکەران. 3. بەرهەمهێنەران. لێرەدا کۆیلەکان کە بەشێکی بەرچاوی حەشیمەتی یۆنانی کۆنیان پێک دەهێنا، وەک چینێک چاویان لێناکرێ. ئەوان وەک بەشێک لە ماڵ و موڵکی هەر کام لەو سێ چینە سەیر دەکران. ئەفلاتوون پێی وابوو کە ئەو سێ چینە هەمان ئەرکیان هەیە کە سێ بەشەکەی رۆح هەیانە.

10. بۆئەوەی دەوڵەت وەک یەکەیەک بتوانێ ئەرکی خۆی بە جوانی راپەڕێنێ، دەبێ ئەم سێ چینە خاوەنی

چ خەسڵەت گەلێک بن؟ خەسڵەتە بابیدارەکانی وان کامانەن؟ لەراستیدا هەر ئەو خەسڵەتانەی ژیانی رۆحیان وەک رۆحێکی ساغ بەرجەستە دەکرد، هەر هەمان ئەو خەسڵەتانەن کە دەتوانن کۆمەڵگایەکی ساغ بەرجەستە بکەن. ئەم خەسڵەتانەش بریتین لە: 1ـ رابەران دەبێ خاوەنی عەقڵ بن، واتە دەبێ بزانن کە چ شتێک باشترینە بۆ کۆمەڵگا. 2ـ بەرگریکەران دەبێ خاوەنی جورئەت و ئازایەتی بن، واتە دەبێ بتوانن سەرەڕای ئەگەری هەر چەشنە مەترسی و دڵەراوکێیەک بڕیار و یاساکان بچەسپێنن. 3ـ بەرهەمهێنەرانیش دەبێ ئارامی و میانەڕەوی لە مەیل و حەزەکانیاندا بنوێنن.

بە وەها خەسڵەتگەلێکەوە دەتوانین بڵێین کە خاوەنی کۆمەڵگای دادپەروەرانەین.

11ـ سەبارەت بە دوو چینی یەکەم و دووهەم ئەفلاتوون پێشنیاری مافی یەکسان بۆ ژن و پیاو دەکا (داوایەکی وەها رادیکاڵانە هەتا شۆڕشی مەزنی فەرانسە نەهاتە گۆڕێ). بەگوێرەی ئەفلاتوون ژنان دەبا وەک پیاوان خاوەنی هەمان دەرفەتی خوێندن و خۆپێگەیاندن، هەمان ماف و ئەرک بان. هۆکارەکەیشی دەگێڕایەوە بۆ ئەوەی ژنان وەک پیاوان لە هەمان توانا و لێهاتوویی بەهرەمەندن.

12ـ بۆئەوەی رابەران لەناو خۆیاندا بە تووش

کێبەرکێ، دوژمنایەتی و مەراقی پلە و پایەوە نەبن، ئەفلاتوون پێشنیار دەکا کە خاوەنداریەتیی تایبەتیان لە نێواندا نەبێت. هەروەها پێشنیار دەکا کە پەیوەندیی هەمیشەیی لەنێوان ژن و پیاودا نەبێ، ژن و منداڵ گشتی بن و منداڵ لەلایەن کۆمەڵگاوە پەروەردە بکرێ.

***

بەکورتی دەتوانین بڵێین کە بەشێک لە رۆح واتە عەقڵ دەتوانێ لە جەستە جیا بێتەوەو بە بێ جەستەش بژی (نەمرە). رۆح دەتوانێ دوای جیابوونەوەی لە جەستە، لە جەستەیەکی دیکەدا درێژە بە ژیان بدا. لە کاتی جیابوونەوەی لە جەستە، رۆح لە پلەیەکی بەرزتری ناسین و زانستدایە. مرۆ وەک بوونەوەرێکی چالاک و هەڵبژێر، رۆحی لە سێ بەش پێک هاتووە: عەقڵ، ویست و مەیل (حەز). کردەیەکی ئەخلاقیی باش ئاکامی هاوکاریی گونجاوی ئەم سێ بەشەیە. هاوکاری و هاوئاهەنگی، پێویستی بە عەقڵ، جورئەت، ئارامی و میانەڕەوییە.
لای ئەفلاتوون یۆتۆپیا باشترین شکڵی دەوڵەتە. دەوڵەت دەبێ لە سێ بەش پێک بێت: رابەران و پارێزگاران، بەرگریکەران و بەرهەمهێنەران. رابەران دەبێ خاوەنی عەقڵ بن، بەرگریکەران جورئەت و بەرهەمهێنەرانیش ئارامی و میانەڕەوی. ئاکامی ئەمە

دەبێ بە کۆمەڵگایەکی دادپەروەرانە.
ئەفلاتوون هەروەها باوەڕی بە یەکسانی مافی ژن و پیاو لە چینی یەکەم و دووهەمدا هەیە، بڕوای بە خاوەنداریەتی تایبەت لەناو رابەراندا نییە و ژن و منداڵیش بە هی هەمووان دەزانێ.

1. فضیلت، Dygd

**ئەرەستو چۆن دەڕوانێتە هاریکاریی نێوان هەست و بیر لە چێکرنی زانستدا. چۆنیەتی روانینی وی بۆ مەتریال، کۆسمۆلۆگ و هۆکار (چوار هۆکار و چوار شێوە گۆڕان).**

1. خاڵی دەستپێک و کێشەی ناسین لای ئەرەستو هەر هەمان ئەو شتانەن کە ئەفلاتوون بیری لێدەکردنەوە. خاڵی دەستپێک سەبارەت بەوە بوو کە دەبێ زانستی ئێمە سەبارەت بە شتە نەگۆڕەکان بێت، بەڵام لە هەمان حاڵدا کێشە ئەوە بوو کە جیهانی بەرهەست نەک نەگۆڕ نییە، بەڵکو بەردەوام لە گۆڕاندایە. جا چلۆن دەکرا کە مرۆ لەناو جیهانی بگۆڕدا بە زانست بگا. ئایا مرۆ دەتوانێ لەسەر جیهانی بەرهەست زانست پەیدا بکا؟ وەڵامی ئەفلاتوون بۆ ئەم پرسیارە "نە" بوو. ئەو پێی وابوو زانیاری ئێمە دەتوانێ سەبارەت بە ئایدیاکان بێت نەک سەبارەت بە شتە بەرهەستەکان.

ئایدیا نەگۆڕە، هەر بۆیە دەتوانێ زانست ببەخشێ. جیهانی بەرهەستیش، چونکە بگۆڕە ناتوانێ بێتە ناسین و لەراستیدا سەرچاوەی زانست نییە. وەڵامی ئەرەستوش بەم پرسیارە "ئەرێ" بوو. ئەو دەیگوت هەموو شتێکی جیهانی بەرهەست لە گۆڕاندا نییە، کە مەبەستی لەمە فۆڕمی شتەکان بوو.

2. نموونە: زانیاری ئێمە لەسەر پشیلە لە بابەت فۆڕمی پشیلەوەیە. واتە ئەو شتەی لە پشیلەکاندا نەگۆڕە و هاوبەشە لەنیوان هەموویاندا.

3. کورتکراوەی بۆچوونی ئەرەستو: لەگەڵ ئەوەی زانست دەبێ لە بابەت شتە نەگۆڕەکان بێت، بەڵام لەهەمان کاتدا دەبێ لە بابەت شتە بەرهەستەکانیش بێت. هەندێ لایەنی دنیای بەرهەست نەگۆڕە. ئەویش بریتیە لەو لایەنانەی هاوبەشن لەنێوان تاکەکانی جۆرێک لە بوونەوەراندا. جا زانست بریتیە لە زانیاری ئێمە لە بابەت خەسڵەتە نەگۆڕەکانی جیهانی بەرهەست.

4. ئەرەستو پێی وایە ئەوەی کە هەیە بریتیە لە لە شتەکان substans. وەسفی ئێمە لە جیهان وەسفی شتەکانە. شت بریتیە لە یەکەی فۆرم و تۆز stoff.

5. وشەی فۆرم بە چەشنێک درێژە و گەشەی وشەی ئایدیای ئەفلاتوونە. گرنگترین جیاوازیی

نێوان "فۆرم" ی ئەرەستو و "ئایدیا"ی ئەفلاتوون ئەوەیە کە کە فۆرم وەک بەشێکی گرنگی شتەکان بوونی هەیە، لە حاڵێکدا ئایدیا سەبەخۆ و سەربەستە لە شتەکان. کەواتە بۆ ئەرەستو تەنیا یەک راستی بوونی هەیە: شتە بەرهەستەکان کە بنەمان بۆ بیر و خەیالاتی ئێمە، بەڵام بۆ ئەفلاتوون دوو شت بوونی هەیە: دنیای ئایدیاکان (کە بنەمان بۆ بیر و خەیاڵ و شتە بەرهەستەکان)، دووهەم، دنیای بەرهەست

6. فۆرم تەنیا بەشێکی شتەکانە. بۆ وێنە گەر پشیلەیەک لەبەرچاو بگرینک بریتیە لەو شتەی هاوبەشە لەنێوان هەموو پشیلەکاندا. لایەنێکی دیکەی شت هەروەها بریتیە لە تۆز کە بۆ وێنە لەنێوان پشیلەکاندا هاوبەش نییە. تۆز ئەو شتەیە کە تاکیەتی شت دەخوڵقێنێ. هەر شتێک بریتیە لە لە یەکەی فۆرم و تۆز، کە تەنیا دەتوانرێ لە بیردا لە یەک جودا بکرێنەوە. فۆرم شێوە کردە بە شت دەبەخشێ و هەر شتێک لەراستیدا خاوەن شێوە کردەی تایبەت بە خۆیەتی. فۆرم بۆ شتی زیندوو بۆ وێنە بریتیە لە ژیان و هەڵسوکەوتی ئەو شتە. بۆ شتێکی وەک تەوریش فۆرم بریتیە لەو ئامانجەی لەپێناویدا دروست کراوە. تۆز بۆ ئۆرگانێکی زیندوو بریتیە لە ئەندامانی جەستەی کە توانایەکان لێیانەوە خۆیان نیشان دەدەن. بۆ شتە نازیندووەکانیش بریتیە لەو مەترِیالەی (دار یاخود ئاسن) کە شتەکە

لێی دروست کراوە. بۆ مرۆڤیش فۆرم بریتیە لە کۆی توانا رۆحییەکان (هەر لە توانای خواردن و خواردنەوەوە بگرە تا توانای بیرکردنەوە)، بەڵام تۆز بریتیە لەو مەرجە مەتریالیانەی (بۆ وێنە لێنزی چاو) کە دەرفەتی روانین دەکا بە حەقیقەت.

7- تۆز دەرفەت و فۆرم حەقیقەتە (واقع). ئەندامە مەتریالییەکانی مرۆ تەنیا دەرفەتگەلێکن بۆ بوون بە مرۆڤێکی زیندوو و چالاک. بۆ وێنە کاتێک مرۆ دەڕوانێ، بەشێک لە فۆرمی مرۆ دەبێت بە حەقیقەت. گەشە و پێشکەوتنی مرۆ بریتیە لە رەوتێک کە تێیدا توانا و لێهاتووییە نوێیەکانی مرۆ گەشە پەیدا دەکەن و دێنە کەڵک لێوەرگرتن.

8- ئەرستو هەروەها لە فۆرم و تۆز وەک هۆکار دەڕوانێ (فۆرم هۆکار و تۆزهۆکار)، بۆ وێنە لە مرۆدا. ئەم دوو هۆکارە پێکەوە ئەوە روون دەکەنەوە کە بۆچی مرۆ مرۆیە. گەر ئەم دوو هۆکارە لە مرۆدا ورد بکەینەوە دەتوانین بڵێن کە مرۆ توانای بیرکردنەوەی هەیە (بیرکردنەوە وەک بەشێک لە فۆرمی مرۆ)، هەروەها مرۆ ئەندامێکی هەیە کە توانای بیرکردنەوەی پێ دەبەخشێ (کە بەشێکە لەو تۆزەی مرۆی لێ خوڵقاوە).
9- کاتێک باس لە زانست دەکرێ، مەبەست زانستە سەبارەت بە فۆرمی مرۆ. ئەگەرچی فۆرم

له هەر مرۆیەکدا شکڵی تاکی هەیە، بەڵام فۆرمی مرۆ هاوبەشە لەنێوان هەموو مرۆڤەکاندا. ئەمە سەرچاوەی زانستی ئێمەیە سەبارەت بە مرۆ وەک بوونەوەرێک.

10. لای ئەرەستو دەرکی سروشت بریتی بوو لەوەی کە سروشت واقعییەتێکە لە شتە جۆربەجۆرەکان. هەروەها ئەوەی کە هەر شت سروشتی خۆی هەیە و دیاردەکانی ناو سروشت ئاکامی فۆرم و کارلێکەری فۆرمەکانە لەسەر یەکتری. کەواتە کلیلی زانست بریتیە لە زانست لەمەڕ فۆرمی شتەکان.

11. پێناسەی مرۆ بەم چەشنەیە: "مرۆ جەستەیەکی زیندووە کە توانای بیرکردنەوەی هەیە." ئەم پێناسەیە نیشاندەری ئەو مانا گشتیەیە کە پێی دەگوترێ مرۆ. لەم پێناسە گشتیەوە دەتوانین گرنگترین خەسڵەتەکانی مرۆ دەستەبەر بکەین. بۆ وێنە ئەوەی کە هەموو مرۆڤەکان دەبێ بمرن.

12. مانا گشتیەکان و زانست بە یارمەتی چڕکردنەوە دێنە چێکرن abstraksjon. ئەمەش تەنیا تایبەت بە مرۆڤە. خاڵی دەستپێک هەستەکانن کە هەموو جەستە زیندووەکان خاوەنین. هەندێ لە جەستە زیندووەکان خاوەنی توانای وەبیرهێنانەوەن کە ئەزموونیان پێ دەبەخشێ. مرۆ هەروەها دەتوانێ مانا گشتیەکان دروست بکا بە کەڵک وەرگرتن لەو خەسڵەت و تایبەتمەندییانەی هاوبەشن لەنێوان

نموونەکانی جۆرێک لە بوونەوەراندا.
13. پێناسە definisjon، زانستی راستەوخۆ نییە، بەڵام زانست بە بێ پێناسە بوونی نییە. پێناسە بریتیە لە ناسینی فۆرمی شتەکان لە رێگای هێنانەوەی دەلیلی لۆژیکی، وەها کە ئەم دەلیلە لۆژیکیانە دەتوانن هۆکارە بنەڕەتییەکانی زانست و زانیاری ئێمە دەستنیشان بکەن.

14. زنجیرەی دەلیلە لێکدراوەکان کە پیشاندەری پەیوەندی لەنێوان ئەو دیاردانەدان کە وا دەنوێنن پێکەوە پەیوەندییان هەیە، پێکهێنەری زانستن.
15.ئیمپیریستەکان پێیان وایە کە سەرچاوەی زانست هەستەکانە. Empirisme. توماس ئەکویناس، جان لاک، بێرکێلی و هیوم ئەو بیرمەندە بەناوبانگانەن کە بە ئیمپیریست ناویان دەرکردووە.

16. لە پێناسەیەکی چڕدا زانست بریتیە لە ناسینی هۆکارەکان. تەنیا ناسینی هۆکارەکانە کە دەرکێکی قووڵترمان لەچاو وەسف سەبارەت بە دیاردەکان پێشکەش دەکا. وەسف پێمان دەڵێ کە دیاردە چۆن دەنوێنێ، بەڵام هۆکار پێمان دەڵێ کە بۆچی دیاردەیەکی تایبەت روودەدات. چوار جۆر هۆکارمان هەیە: فۆرم هۆکار، تۆز هۆکار، هۆکاری کارتێکەر و مەبەست هۆکار. بۆ نموونە دەتوانین لە سازکردنی خانوویەکدا هەر چوار هۆکارەکە ببینینەوە: فۆرم

هۆکار (پلانی خانووەکە)، تۆزهۆکار (ئەو کەرەسانەی لە چێکرنی خانووەکەدا بەکار دەهێنرێن)، هۆکاری کارتێکەر (ئەوانەی کاری تێدا دەکەن)، مەبەست هۆکار (ئەو مەبەستەی خانووەکەی بۆ چێکراوە، واتە ژیان بەسەربردن تێیدا). کاتێک باسی دیاردە سروشتییەکان دەکرێ فۆرم هۆکار و مەبەست هۆکار دەبنە یەک و لە یەکتردا دەتوێنەوە. بۆ وێنە ئامانجی بەمرۆبوون بریتیە لە بە واقعییەتکردنی فۆرمی خۆی.

17. ئەرەستو بۆ شیکردنەوەی دیاردە سروشتیەکان لە هەر چوارهۆکارەکە کەڵک وەردەگرێ، بەڵام لە سەدەی هەڤدەدا بە هاتنە ئارای راڤەی میکانیکیانە لە سروشت و لە مرۆ، تەنیا باوەڕ بە هۆکاری کارتێکەر و تۆز هۆکار لە مەیداندا مایەوە. هەر بۆیە لەو کاتەدا تەنیا وەسفێک لە دیاردەکان پێشکەش دەکرا و بەس. بۆ وێنە دەگوترا "شووشە پەنجەرە دەشکێ (کارتێکردن) چونکە بەردی وێکەوتووە (هۆکار)"، یان "منداڵ گەورە دەبێ (کارتێکردن) چونکە دەخوا و دەخواتەوە (هۆکار)"، بەڵام ئەرەستو دەپرسێ "بۆچی شووشەی پەنجەرە دەشکێ کاتێک کە بەردی وێ دەکەوێ؟" بۆ وەڵام کەڵک لە فۆرم هۆکار وەردەگرێ و دەڵێ: "چونکە شووشە دەشکێ". لە وەڵامی پرسیاری منداڵەکەشدا دەڵێ: "چونکە سروشتی منداڵ وایە". بە واتایەکی دی

راڤەی میکانیکیانە باس لە هۆکارە دەرەکیەکان دەکا و راڤەی ئەرەستوش باس لە هۆکارە دەروونیەکان (فۆرم، سروشت و زاتی شتەکان).

18. دەرکی ئەرەستو لە سروشت لەسەر سێ بنەما راوەستاوە: 1. ناتوانین شکڵە جۆراوجۆرەکانی گۆڕان تەنیا بۆ یەک هۆکار دابەزێنین. 2. واقعییەت لە شتە جۆربەجۆرەکان پێک هاتووە، هەر کام بە سروشتی تایبەت بە خۆیەوە. 3. هەر گۆرانێک بە واقعیکردنی دەرفەتێکە.

19. دەرکی ئەرەستو بۆ سروشت لەسەر بڕوابوون بە چوار جۆرە گۆڕان لەناو سروشتدا راوەستاوە: 1. گۆڕانی چلۆنایەتی، کە تێیدا چلۆنایەتی شت گۆڕانی بەسەردا دێت، وەک تام و رەنگ و بۆ. 2. گۆڕانی چەندایەتی، وەک گۆڕان لە قەوارە و ژمارەدا. 3. گۆڕانی شوێن، کە تێیدا شتەکان جێگۆڕکی دەکەن. ئەرەستو ئەم سیانە پێکەوە ناودەنێ "گۆڕانی نازاتی"، بەو مانایە کە شتەکان دەگۆڕدرێن بە بێئەوەی شتی نوێیان لێبکەوێتەوە، یان بگۆڕدرێن بەرەو شتی نوێ. 4. گۆڕانی زاتی، کە تێیدا شتی نوێ دێتە گۆڕێ، بۆ وێنە گۆڕانێک کە بەهۆی لەدایکبوون و مردنەوە روودەدات.

20. زانستی کۆسمۆلۆگیانەی ئەرەستوش لەسەر

چوار ئێلەمێنت رۆنراوە: خاک، ئاو، هەوا و ئاگر. لە کۆسمۆسدا (جیهانی بوون) ئەم چوارە بەگوێرەی قورساییان رێکخراون. قورسترینیان کە خاکە لە ناوەندی جیهاندا قەراری گرتووە. دوای وی ئاو و هەوا دێن. لە پلەی چوارەمیشدا ئاگرەکە سووکترینیانە. لە دەرەوەی هەمووی ئەمانە پێنجەمین ئێلەمێنت دێت کە ناوت "ئێتێر" ە Eter و شتەکانی ئاسمان لەو چێکراون. لە دەرەکیترین و دواترین بەشی کۆسمۆسیشدا یەکەمین جوڵێنەر (خودا) دەژی کە سەرچاوەی هەموو گۆڕانەکانە لەناو کۆسمۆسدا. خودا، فۆرمێکی خالس و بێ خەوشە ren form .

21. شتەکان لە کۆسمۆس بەپێی پێکهاتەیەکی هیرارکیانەوە رێکخراون. هەرە لە خوارەوە تۆزی خالس و بێ خەوش قەراری گرتووە و هەرە لە سەرەوە فۆرمی خالس و بێ خەوش. ئەو شتانەی بەشێکی زۆرتریان لە فۆرمی خالس بەرکەوتووە، پڕبایەخدارترێکن لەوانەی وا کەمتریان بەرکەوتووە.

## بەکورتی:

واقعییەت لە یەکەمین برگەی خۆیدا بریتیە لە شتە بەرهەستەکان، نەک لە ئایدیاکان. هەر شتێک دەتوانرێ بەهۆی فۆرم و تۆزەوە ئانالیزە بکرێ، بەڵام فۆرم و تۆز بەجیا بوونیان نییە. فۆرم ئەو شتەیە کە لەنێوان تاکەکانی جۆرێک لە بوونەوەراندا هاوبەشە و تەنیا ئەمەیە کە ئێمە دەتوانین زانستمان لەسەری هەبێ. تۆز ئەو مەتریالەیە کە مەرجە بۆئەوەی فۆرم بتوانێ خۆی رئالیزە بکا. لە تۆزدا دەرفەتێک هەیە بۆ رئالیزەکردنی فۆرم. هەموو زانستی ئێمە لەسەر هەستەکان راوەستاوە کە سەرەتان بۆ چێکرنی مانا گشتیەکان.

زانست بریتیە لە زانیاری سەبارەت بە هۆکارەکان، ئەو هۆکارانەی کە واوەتر لە وەسف، دەتوانن شیکردنەوەمان پێشکەش بکەن (چوار هۆکار). راڤەی سروشتیانەی ئەرەستو پتر گرنگی دەدا بە هۆکاری فۆرمی (سروشت و زاتی شتەکان). ئەمە بەپێچەوانەی راڤەی میکانیکیانەیە کە کەڵک لە هۆکاری کارتێکەر و تۆزهۆکار وەردەگرێ.

گۆڕان لە سروشتیشدا چوار جۆرە. کۆسمۆس لە چوار ئێلەمێنت پێکهاتووە (ئێلەمێنتی پێنجەمیش ئێتێرە کە شتەکانی ئاسمان لەو دروست بوون). سترۆکتۆری کۆسمۆسیش ئاکامی ئەو شێوە دارِشتن و رێک و پێکیەیە کە لەنێوان ئەم ئێلەمێنتانەدا هەیە.

**ڕوانگەی ئەرەستو لەسەر ڕۆح، بەشەکانی ڕۆح، لەسەر موراڵ وەك بەواقعكردنی دەرفەتەکان. ئایا هەموو مرۆڤەکان وەك یەك دەرفەتی گەشەی موراڵیان هەیە؟ هەروەها ڕوانگەی وی سەبارەت بە کۆیلایەتی و ژنان.**

1ـ لە سروشت کە دەستکردی مرۆ نییە، جیاوازییەکی گرنگ لەنێوان بوونەوەرە گیانلەبەرەکان و بوونەوەرە بێ گیانەکاندا هەیە: گیانلەبەرەکان ئەکتیڤن و خۆیان جوڵێنەری خۆیانن بە بێ پاڵنەرێکی دەرەکی، بەڵام بێ گیانەکان دەجوڵێندرێن. واتە ئەوان پاسیڤن و شتێکی دەرەکی پاڵنەریانە بۆ جوڵە و گۆڕان. ئەرەستو بۆ پێناسەکردنی ڕۆح لەم جیاوازییە گرنگە کەڵک وەردەگرێ، واتە لای ئەو ڕۆح بریتیە لەو توانا ئەکتیڤ و خۆرسکیەی بوونەوەرە گیانلەبەرەکان خاوەنین.

2ـ بە بۆچوونی ئەرەستو هەموو ئۆرگانیزمە زیندووەکان ـ گیا، ئاژەڵ و مرۆـ خاوەنی ڕۆحن و جیاوازیی نێوانیان تەنیا لەوەدایە کە تا چەند و چ ئاستێک توانای دەربڕینی ژیانیان هەیە. بەڕای وی توانای ژیان لەنیوان ئەم ئۆرگانیزمانەدا جیاوازەو هەر بۆیە لە سێ ئاستی جیاوازدان. ئەرەستو ئەم سێ ئاستە لە نزمەوە بەرەو بەرز دەستەبەندی دەکا.

3. گیا و ڕووەک لە ئاستی هەرە نزمدان کە ئاستی دەربڕینی ژیانیان بریتیە لە خۆراک وەرگرتن، نەش و نماکردن و زیادکردن (زاوزێکردن).

4. لە ئاستی سەرەوەتردا ئاژەڵ ڕاوەستاوە، کە جگە لە تایبەتمەندییەکانی گیا و ڕووەک، توانای هەستکردنیشی هەیە. ئاژەڵ دەتوانێ هەست بە پێداویستیەکانی بکا (بۆ وێنە تینویەتی) و هەوڵ بۆ دابینکردنیان بدات.

5. لە ئاستی هەرە بەرزیشدا مرۆ ڕاوەستاوە کە جگە لەو تایبەتمەندییانەی ڕووەک و ئاژەڵ لێی بەهرەمەندن، خاوەنی توانای بیرکردنەوەشە. مرۆ زمان دەخوڵقێنێ، دەتوانێ دیاردەکان لێک بداتەوەو پلان بۆ کردەوەکانی دابڕێژێ، کە ئەمەش لەپێناوی دابینکردنی پێداویستیەکانیدایە.

6. ئەم سێ ئاستە پێکەوە لە یەک کاتدا لە مرۆدا هەن. ئەم پێکەوەبوونە دەبێتە هۆی کارلێکەری دوولایەنەی وان لەسەر یەکتر. بۆ وێنە هەست ژیانی زاوزێ دەخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە و بیریش کار دەکاتە سەر هەست و بەپێچەوانەوە. هەڵبەت ئەو خۆراکەی ڕووەک پێویستیەتی جیاوازە لەو خۆراکەی ئاژەڵ و مرۆ پێویستیانە. هەست و دەرکی ئاژەڵیش جیاوازە لە هی مرۆ، بەڵام بەهەرحال لە

مرۆدا ئەم سێ ئاستە دەبیندرێ.
7. رۆح لای ئەرەستو، فۆرمی بوونەوەرە گیانلەبەرەکانە. جەستەشیان تۆزی بوونەوەرە گیانلەبەرەکەیە. چ لە بابەت دیاردە سروشتیەکانەوە و چ لە بابەت دیاردە دەستکردەکانەوە ئەوە فۆرمە کە دەتوانێ دیاریکەرو شیکەرەوەی تۆز بێت. بۆ وێنە چاوی پشیلە کە ئەندامی دیتنیەتی لەوەوە دیاری دەکرێ و شی دەکرێتەوە کە پشیلە ئاژەڵێکی شەوییە. رۆح (ژیانی ئۆرگان) دیاریکەری جەستەیە. بۆ وێنە توانای خۆراک وەرگرتن لەگەڵ ئەندامی خۆراک وەرگرتندا دێتەوە (رەگ، دەم).

8. توانا و ئۆرگان پێکەوە پێکهێنەری یەکەیەکی لێک نەپچڕاون لە بوونەوەرە گیانلەبەرەکاندا. فۆرم و تۆز دوو لایەنی شتن. فۆرم و جەستەی مرۆ پێکهێنەری یەکەیەکن بە ناوی مرۆ. گەر توانای ژیان (فۆرم) مرۆ جێبێڵێ، چیدی ئیتر مرۆ نییە. پەیوەندیی رۆح لەگەڵ جەستە وەک پەیوەندیی "کردە" وایە لەگەل "ئەندام"، یان "کارتێکەر" لەگەڵ "ئامراز".

9. کەواتە بەپێچەوانەی رای ئەفلاتوون رۆح دیاردەیەکی نامۆ لە مرۆدا نییە. لەراستیدا رۆح بەشێکی جیانەکراوەی مرۆیە. بەپێچەوانەی رای ئەفلاتوون رۆح ناتوانێ سەربەخۆ بژی. رۆحی مرۆ دیاریکەری ژیانی مرۆ و تایبەتمەندیی مرۆبوونە.

10. پرسیارە مۆراڵییەکان لە یۆنانی کۆندا بەشێوەی جیاواز لە ئێستا دەهاتنە گۆڕێ و وەڵام دەدرانـەوە. ئێمە ئێستا دەپرسین کە: "ڕاستی و ناڕاستی کامانەن؟"، بەڵام ئەرەستو دەیپرسی: "چاکە و خراپە چین؟" مرۆ خاوەن سروشتێکە کە لە کۆمەڵێک ئاست و توانا پێک هاتووە. مرۆ تەنیا کاتێک دەتوانێ سروشتی خۆی وەک مرۆ بەرجەستە بکا و وەک یەکەیەک خۆی بنوێنێ کە بتوانێ توانا جۆراوجۆرەکانی خۆی پێکەوە ڕێک بخا و بیانگونجێنێ. (ئەفلاتوونیش باوەڕی بە هاوئاهەنگیی بەشە جۆربەجۆرەکانی ڕۆحەوە هەبوو).

11. بڕوایەکی گرنگ لای ئەرەستو: بوونەوەر کاتێک دەتوانێ ژیانێکی باش و بەختەوەرانەی هەبێ کە بەپێی سروشتی خۆی بژی. ئەمە مرۆڤیش دەگرێتەوە: مرۆ کاتێ بەختەوەرە کە دەرفەتی گەشەپێدانی تواناییەکانی هەبێ بەشێوەیەک کە هاریکاریی ئەو هاوئاهەنگی نێوانیان بتوانێ ئەو کێشانە چارەسەر بکا کە دێتە سەر ڕێگایان. بۆ ئەم مەبەستەش ئەم شتانە پێویستن: 1) خەسڵەتە پڕبایبیدارەکان. 2) کۆمەڵگایەکی گونجاو و باش.

12. ئێتیک بریتیە لە گەشە و ڕاگواستنی توانا سروشتیەکانی تاک بەرەو خەسڵەتە پڕبایبیدارەکان. خەسڵەتە پڕبایبیدارەکان ئامرازێکی پێویستن بۆ گەیشتن بە خۆشبەختی، ئەو خۆشبەختیەی ئامانجی گەشەی ئەخلاقییە. خەسڵەتە پڕبایبیدارەکان ناهێڵن کە بۆ وێنە

هەست سەرچاوەی کردارەکان بێت، بەڵکو سەرچاوەی کردار دەبێ ئەقڵ و بیرکردنەوە بێت. ئەم خەسڵەتانە یارمەتی مرۆ دەدەن کە بە دژی حەز و کردە ناشازەکان رابوەستێ.

13- خەسڵەتە پڕبابیدارەکان سەرچاوەی کردە و ئاکارن. هەروەها پیشاندەری کردەی میانەن لەنێوان دوو جەمسەری زێدەڕۆیی و کەمڕۆییدا. ئەوەی کە دەهێڵی هەستەکان راستەوخۆ دیاریکەری کردە و ئاکاریان بن، ئەوا بە توش کردە خراپەکانەوە دەبن. بۆ وێنە ترسنۆکی لە ترسی زۆرەوەو بێ بانکی لە بڕوا بە خۆبوونێکی لە رادەبەدەرەوە دێت کە هەردووکیان نەشیاون. هەر خەسڵەتێکی پڕبابیدار خاڵی نێوان دوو جەمسەری زێدەڕۆیی و کەمڕۆییە.

14- تەنیا لە دوو ئاستی رۆحی ئاژەڵی و رۆحی مرۆییدایە کە دەرفەتی هەڵبژاردن لە بواری کرداردا هەیە، ئەم دەرفەتە لە ئاستی رۆحی ئاژەڵیدا لە بواری پێویستیدا خۆی دەنوێنێ. بۆ وێنە برسیەتی دەبێتە هۆی ئەوە کە برسی بە شوێن تێربووندا بگەڕێ. لە ئاستی مرۆییشدا دەرفەتی هەڵبژاردن لەنێوان ئەڵتەرناتیفە جۆربەجۆرەکاندا هەیە. بۆ وێنە مرۆ وەک ئاژەڵێکی عاقڵ دەتوانێ هەڵسەنگێنێ و هەڵبژێرێ. بیرکردنەوە دەگاتە قۆناغی بڕیاردان، بڕیاردانیش کۆمەڵێک کردەی لێدەکەوێتەوە کە ئاراستەی ئامانج دەکرێ.

15. خەسڵەتە پڕبایبیدارە ئەخلاقیەکان گرنتیی ژیانێکی بەختەوەرانە ناکەن، چونکە خۆشبەختی پەیوەندی بە کۆمەڵگاوە هەیە، بەڵام خەسڵەتە پڕبایبیدارە ئەخلاقیەکان دەرفەت بۆ ژیانێکی بەختەوەرانە باشتر دەڕەخسێنن. خۆشبەختی، دۆخێکی رۆحیە کە بەرهەمی بەئاکامگەیشتنی هەوڵ و تەقەللا و زاڵبوون بەسەر کۆسپەکاندایە.خۆشبەختی ئاوێتەی هەوڵە ئازاراوییەکانە و هەربۆیە ناکرێ بڵێین کە خۆشبەختی هەمان لەززەت و خۆشیە. بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە خۆشبەختی ناتوانێ لە لەززەت و خۆشی بێ بەهرە بێت.

16. خەسڵەتە پڕبایبیدارە ئەخلاقییەکان بە سێ شێوە خۆیان نیشان دەدەن: 1) مرۆ دەکرێ بەهۆی سزا و پاداشەوە کردە ئەخلاقییە باشەکان بۆ وێنە ئازایەتی، دڵسۆزی یا دادپەروەری لە خۆی نیشان بدات. لێرەدا کۆمەڵێک دیسیپلین هەیە کە سەرچاوەی کردارە. مرۆ دروست هەڵسوکەوت دەکا، بەڵام ئۆتۆماتیکی و تەنیا بەو هۆیەوە کە خۆی لەگەڵ کۆمەڵێک نەریت رێک خستووە. 2) بکەر پابەندە بە خەسڵەتە پڕبایبیدارە ئەخلاقییەکان، چونکە بۆ وێنە ژیریی دەبێتە هۆی ئاکاری باش، واتە خەسڵەتە پڕبایبیدارەکان دەبنە سەرچاوەی ئاکاری باش. هەڵبەت لێرەدا بکەر رێزیش لە یاسا دەگرێ. 3) لە رێگای لێکدانەوەوە، واتە هەڵبژاردنی ژیریی لە رێگای هەڵسەنگاندنییەوە لە گەڵ ئاکارەکانی دی. ئەنجام: مرۆڤێکی وەها خاوەنی زیرەکییە.

17.زیرەکی خەسڵەتێکی پڕباییداری هوشیارانەیە (نەک ئەخلاقیانە) کە پەیوەندیی بە توانای بیرکردنەوەوە هەیە. لێرەدا ئەم خەسڵەتە خۆی جیا دەکاتەوە لە خەسڵەتی پڕباییداری ئەخلاقی کە لەسەر بنەمای عادەت، پێداویستی و هەست راوەستاوە. ئەوەی کە زیرەکە دەتوانێ دیاری بکا کە چ شتێک باشترینە بۆ مرۆڤ.

18.ئەرەستو پێی وایە کە مرۆ جۆراوجۆرە. سروشت مرۆڤی وەک یەک نەخوڵقاندووە. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوە کە دەرفەتە دەروونیەکانی خۆرئالیزەکردن وەک یەک نەبن و مرۆڤەکان بە شێوازی جۆراوجۆر بە شوێن خۆرئالیزەکردنەوەوە بن. بەگوێرەی ئەرەستو پیاو سروشتێکی بدەر و ژن سروشتێکی وەرگری هەیە. ئەمە هەم لە زاوزێکردندا راستەو هەم لە رێکخستنی کۆمەڵایەتیدا. هەندێک مرۆ لە بنەڕەتەوە و بەپێی سروشت بۆ کۆیلەتی دروست کراون. واتە ئەو مرۆڤانەی دەرفەتی ئەوەیان نییە وەک مرۆ ئازادەکان خەسڵەتە پڕباییدارەکان لە خۆیاندا گەشە پێبدەن و رئالیزە بکەن.

## بەکورتی:

مەبەستی ئەرەستو لە رۆح ئەو خەسڵەتەیە کە توانای ژیان دەبەخشێ، واتە توانای خۆ جولاندن و گۆڕانی خۆ. ژیان فۆڕمی جۆراوجۆری هەیە، لە هەرە سادەوە بگرە هەتا هەرە ئاڵۆزەکەی. رووەکەکان خۆراک وەردەگرن، گەورە دەبن و زیاد دەکەن. ئاژەڵ جگە لەم خەسڵەتانە بە شوێن تێرکردنی پێداویستیەکانی دیکەیەتی و مرۆڤیش جگە لەمانە خاوەن توانای بیرکردنەوەیە. لای بوونەوەرێکی زیندوو رۆح بریتیە لە توانا جۆربەجۆرەکانی ژیان، بەڵام جەستە بریتیە لەو تۆزەی دەرفەتی بە واقعکردنی توانا رۆحیەکان دەرەخسێنێ (بۆ وێنە رەگ، لاسک و گەڵا لای رووەک، هەستەکان لای ئاژەڵ و مێشک لای مرۆڤ). بەپێچەوانەی رای ئەفلاتوون رۆح بەشێکی جیانەکراوەیە لە یەکەیەک بە ناوی مرۆڤ.

## ئامانجی ئەخلاق:

ئامانجی ئەخلاق دەستەبەرکردنی باشترین ژیانە بۆ مرۆڤ. لە ڕێگای گەشەپێدانی هەست و توانا سروشتیەکانەوە مرۆ دەتوانێ بەم ئامانجانە بگا. واتە لە ڕێگای خۆبەدەستەوەنەدان بە هەست و پێداویستیەکانییەوە، بەڵکو لە ڕێگای هاوترازکردن و چەشنە هەماهەنگییەک لەنێوان هەستەکان و بیرکردنەوەدا. مرۆ بەم شێوەیە دەتوانێ بە شوێن ئەو کردارانەدا بڕوات کە ئاکامی درێژخایەنتری هەیە، نەک کاتی. وەستان لە دژی حەز و خولیاکان و خۆدوورخستنەوە لە ژان و ئازار بەمەبەستی گەیشتن بە باشیەکی بەرزتر. جیاوازیی هەیە لەنێوان لەززەت و خۆشبەختیدا.
پیاوان و ژنان دوو جۆرە ئەرکی ئەخلاقیان هەیە. پیاو دەبێ بڕیاردەری ناوماڵ بێت و ژنانیش دەبێ گوێرایەڵی ئەو ئەرکانەی بن کە پێیان سپێردراوە.

# سەدەکانی ناوەڕاست

کۆیلەکانیش دەبێ ئامرازی بەردەستی مرۆڤە ئازادەکان بن.

## بەگشتی دەربارەی سەدەکانی ناوەڕاست

1. لێرەدا لەگەڵ دوو چەمک ڕووبەڕووین: "بڕوای ئایینی" و "بڕوای زانستی". بڕوای ئایینی هەروەک بڕوای زانستی لە هەمان ئاستی متمانە و ڕەزامەندی بەهرەمەندە. هەبوونی زانست تەنیا بە مانای زانیاری متمانەپێکراو نییە، بەڵکو وشیارییەکی ئۆبژکتیڤە (پەیوەندی بە دونیای ڕاستیەکانەوە هەیە) بەشێوەیەک کە مرۆ دەتوانێ لە ڕێگای هەستەوە ڕاستەوخۆ، یاخود لە ڕێگای ئەو زانیاریانەوە بە دەستی بێنێ کە پەیوەندی بە سەرچاوە سروشتیەکانەوە هەیە. زانستی سروشتیش بەو مانایە کە مرۆ زانست لە ڕێگای توانا سروشتیەکانی خۆیەوە، واتە لە ڕێگای هەست و بیرەوە دەستەبەر دەکا .

2. گرنگترین خاڵی دەستپێک بۆ مرۆڤی مەسیحی، بوونی خودایە. لە بابەت زانیاری لەمەڕ بوونی خودا سێ جۆرە بۆچوون هەیە: 1) ناسینی خودا تەنیا لە ڕێگای بڕواوە. 2) ناسینی خودا لە ڕێگای هەست و بیرەوە. 3) ناسینی خودا لە ڕێگای بڕوا و بیرەوە. ئۆگۆستین و ئەکویناس بڕوایان بە بۆچوونی سێهەم هەبوو.

3. ئۆگۆستین پێی وایە کە ناسینی مرۆ لەمەڕ خودا لە بڕواوە دەست پێدەکا (مرۆ دەبێ بڕوای هەبێ بۆئەوەی بتوانێ تێبگا). بڕوا دەتوانێ بەهێز بکرێ بەهۆی ئەو زانیاری و بەڵگانەی پێکهێنەری زانستن (مرۆ دەبێ تێ بگا بۆئەوەی بروای هەبێ).

4. ئەو زانیاری و بەڵگانەی بوونی خودا دەسەلمێنن، پێیان دەگوترێ "بەڵگەی سەلماندنی خودا"، کە دوو جۆرن: 1) پێش بەڵگە1 : بەگوێرەی ئەم بۆچوونە بەپێی وێنایەک کە مرۆ لە خودا لە بیری خۆیدا هەیەتی، بیروەشوێن ئەوە دەکەوێ کە ئەم هەبوونە بسەلمێنێ. 2) پاش بەڵگە 2: کە بەهۆی کۆمەڵێک فاکت و راستییەوە مرۆ بە بوونی خودا دەگا. خودایەک کە خولقێنەری ئەم شتانەیە و دەکرێ هۆکاری هەبوونی دنیامان بۆ شی بکاتەوە. بەناوبانگترین پاش بەڵگە بۆ سەلماندنی بوونی خودا بۆچوونێکی ئەکویناسە کە بە "رێگاکانی گەیشتن بە خودا" ناوبانگی دەرکردووە. ئەم بۆچوونە پێمان دەڵێ کە دنیا پلانێکەو چونکە هەر پلانێکیش خاوەن پلان دارێژەرێکە، کەواتە خودا دارێژەری پلانی دنیایە (بوونەوەرێکی وشیار کە خولقێنەر و بەڕێوەبەری هەموو شتە سروشتیەکانە).

5. لای ئەکویناس، تیولۆژی هەموو راستییە ئایینییەکان لەخۆ دەگرێ، کە بە چەند شێوە دەناسرێن:

1) لە فۆرمی خودادا کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ وەحی یان ئەو پەیامە خوداییانەی پەیامبەران ڕاستەوخۆ لەلایەن خوداوە بەدەستیان گەیشتووە.
2) لە فۆرمی زانستدا کە لە ڕێگای توانا سروشتیەکانی ناسینەوە دەستەبەر دەکرێن (تیۆلۆژی سروشتی).
ئەکویناس دەڵێ کە زۆربەی ڕاستییە ئایینییەکان بۆ وێنە بوونی خودا و نەمریی ڕۆح دەکرێ لە هەر دوو ڕێگاوە زانستی لەسەر پەیدا بکەین، بەڵام هەندێک لە ڕاستییەکانی وەک "خوڵقاندنی دنیا" و دۆگمای ئەوەی کە خودا و مەسیح و ڕۆحی موقەدەس یەکەیەکن، تەنیا لە ڕێگای بڕواوە دەتوانین زانستی لەسەر پەیدا بکەین.

6.ئەکویناس هەروەها قسە لەسەر جیاوازییەکانی نێوان زانست، بڕوای ئایینیی و وەهم دەکا. بڕوا وەک زانست ناسینێکی متمانە پێکراوە، بەڵام وەهم بەپێچەوانەوە ناتوانرێ متمانەی پێ بکرێ.
بڕوا جیاوازی هەیە لەگەڵ زانست، لەبەرئەوەی کە ئەو متمانەیەی بڕوا دەیبەخشێ لەسەر بڕیارێکی خوازراو ڕاوەستاوە کە لەدوا وتەدا سەرچاوەکەی بۆ خودا دەگەڕێتەوە. بۆ وێنە ئەوەی کە "من بڕوام بەوە هەیە کە خودا دنیای خوڵقاندووە" لەسەر ئەو گریمانەیە ڕاوەستاوە کە لەوەپێش من ویستبێتم کە بەم بۆچوونە بڕوا بێنم. ئەوەی کە بۆ وێنە من دەزانم کە دوو کۆی دوو دەبێتە چوار، دەگەڕێتەوە بۆئەوەی من لە ڕێگای پەیوەندی بە ڕاستیەکانی دەرەوەی خۆمەوە، واتە

ئەوەی کە لە دونیای واقعدا هەیە، بەم راستیە و زانستە گەیشتووم.

## روانگەی ئۆگۆستین لە بابەت خودا، جیهان و مرۆڤ. ئۆگۆستین چۆن دەڕوانێتە خۆشەویستی. تیۆری وی لە بابەت دەوڵەتی زەمینی، دەوڵەتی خودائی و تیۆری مێژوو.

1. لەراستیدا شوێنی مرۆ لە جیهانبینیی ئۆگۆستیندا دەتوانێ دەستپێکی روانینی وی لە بابەت پەیوەندیی نێوان خودا، جیهان و مرۆڤەوە بێت. بەرای ئۆگۆستین مرۆ لە پلەی خوارەوەی خودا و بوونەوەرە ئاسمانیەکاندا قەراری گرتووە، بەڵام هەر لەو حاڵەدا تاجی سەری خوڵقاندوەو لە هەموو بوونەوەرە زەمینیەکانی دیکە پایەبەرزترێکە. خودا کە بوونەوەرێکی بان سروشتیە، جیهان و مرۆڤی خوڵقاندووە. مرۆ بەگشتی جیاوازە لە بوونەوەرەکانی دیکە، هۆکارەکەیشی ئەوەیە کە خودا مرۆڤی لەرووی خۆیەوە خوڵقاندووە. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوە مرۆ بتوانێ خودا وەک سەرچاوەی بوونی خۆی سەیر بکا و بیناسێ. هەروەها لای ئۆگۆستین ئینسان بوونەوەرێکی رۆحیە (نەک تەنیا بوونەوەرێکی خاوەن توانای بیرکردنەوە، بەو جۆرەی ئەرەستو

پێناسەی دەکرد).
2. مرۆڤ چونکە خوڵقاوی دەستی خودایە کەواتە نیازی هەیە کە بەرەو ڕووی بگەڕێتەوە. ناسینی خودا بریتی نییە لە وەدەستهێنانی زانست و زانیاری لەمەڕ خودا، بەڵکو بریتیە لە یەکبوون لەگەڵ خودا و خۆش ویستنی، هەر بەو شێوەیەی عاشق بە شوێن یارەوەیە. بۆئەوەی ئەم یەکبوونە بێتە چێکرن دەبێ خوا بەهۆی روحم و بەزەیی خۆیەوە خۆشەویستی خۆی ئاراستەی مرۆ بکا. خۆشەویستی خودا بۆ مرۆ تەواوکەری خۆشەویستی مرۆیە بۆ خودا. سەرچاوەی گوناە نەبوونی خۆشەویستی یاخود کەمیی خۆشەویستییە بەرامبەر بە خودا. نەبوونی خۆشەویستی هۆی سەرپێچی لە خواستەکانی خواوەندە. خۆشەویستیی خواوەند گەلێک بەرزترە لە خۆشەویستی دونیا و تەنانەت مرۆ خۆیشی. ئەم جۆرە خۆشەویستیە سەرچاوەی بیری گۆشەگیریانەی ئۆگۆستینە کە مرۆ تێیدا بە سادەیی و قەناعەت دەژی و خۆی لە خۆشی و لەززەتی دونیا دوور رادەگرێ.

3. بە رەوایەتی ئەنجیل و بە گوتەی ئۆگۆستین خودا دونیای لە هیچەوە چێ کرد. ئەمە رازێکە مرۆ بەزەحمەت تێی دەگا. لە کاتی خوڵقاندندا سەرەتا خواوەند تۆزی خوڵقاند، ئەوجا فۆرم و لەگەڵیا کات (ئەفلاتوون دەیگوت کە لە پێش خوڵقاندنی

دونیادا جیهانی ئایدیاکان هەبووە، ڕەنگە تۆزیش). لەبەرئەوەی لە پێش خوڵقاندندا هیچ شتێک لەئارادا نەبوو و خودا بۆ خۆی هەموو شتێکی دروست کرد، هیچ لێکچوونێک لەنێوان خوڵقێنەر (خودا) و خوڵقاندندا (دونیا، سروشت) نییە. خودا و جیهان بەتەواوی لێک جوودان.

4. کەواتە ناتونین خودا بەو چەمکانەوە پێناسە بکەین کە سەرچاوەیان لە دونیادایە. هەروەها ئێمە ناتوانین لە ڕێگای توانا سروشتیەکانی خۆمانەوە لە خودا و گەورەیی خودا بگەین. توانا سروشتیەکانی ئێمە تەنیا دەتوانن یارمەتیدەر بن بۆ تێگەیشتنی ئەو پەیوەندیانەی لەنێوان بوونەوەرەکانی دونیادا هەیە. خوا بەهۆی ڕوحم و بەزەیی خۆیەوە وشیاری بە مرۆ دەبەخشێ. هەروەها لە ڕێگای پەیوەندیی ڕاستەوخۆوە (وەحی) ئەشقی ئەو دێتە ژووانی ئەشقی مرۆی شەیدای خودا.

5. عەشق بە خودا گرنگترین و سەرەکیترین جۆری عەشق و خۆشەویستیە. ئەرکی مرۆڤە کە مرۆڤی خۆش بویێت. ئەم ئەرکە بۆ هەموانە. ئەگەر ئێمە ناتوانین بە کردەوە ئەشق و خۆشەویستی خۆمان بە هەموو ئینسانەکان نیشان بدەین، پێویستە لەجیاتی ئەمە خۆشەویستی خۆمان سەبارەت بەو مرۆڤانە نیشان بدەین کە لە ژیاندا لەگەڵمان لە پەیوەندیدان.

دەبێ مرۆڤمان خۆش بوێت، بەڵام نەک لەبەرخاتری مرۆ، بەڵکو لەبەر خودا و راکێشانی رەزامەندی وی.

6. ئەو مرۆڤانەی کە تەنیا خۆیان خۆش دەوێت دەبن بە شارۆمەندی "دەوڵەتی خودا". ئەوانەش وا بە دنیاوە سەرقاڵن دەبن بە شارۆمەندی "شاری بابیلۆن" واتە "دەوڵەتی زەوی". ئەم دوو دەوڵەتە لە یەک کاتدا پێکەوە لە سەردەمی ئێمەدا هەن. وەک جەستە ئاوێتەی یەکن، بەڵام لە دڵیاندا جودان. دوای مردنی دەوڵەتی زەوی ئەم دووانە لە جەستەشدا لە یەک جودا دەبنەوەو دواتر لە فۆرمی بەهەشت و جەهەننەمدا درێژە بە ژیان دەدەن.

7. تیۆری دوو دەوڵەت و پێشبڕکێ و ململانێی نێوانیان، کاکڵی تێگەیشتنی ئۆگۆستینە لە مێژوو. مێژووی جیهان لە خوڵقاندنەوە دەست پێدەکا، بە گوناحی ئادەم و حەوا درێژەی دەبێ، دواتر رزگاری دەبێ، ئەوسا جیهان دەمرێ و دەبێ بە قیامەت. قیامەت نیشانەی سەرکەوتنی خودایە. وەک دەبینین رەورەوەی مێژوو لەم تیۆرەدا لە یەک هێڵدا بەرەو پێش دەچێ (تێگەیشتنی هێڵ ئاسا لە مێژوو). هەروەها بەگوێرەی ئەم تیۆرە مێژووی جیهان تەنیا یەک جار روو دەدات. ئەمە بەپێچەوانەی تیۆری سەردەمی کۆنە، ئەو بۆچوونەی پێی وابوو هەموو

شتێک دووپات دەبێتەوەو رەوتی مێژووش بازنەییە. لەراستیدا سەرچاوەی ئەم بۆچوونە باوەی سەردەمی ئێمە کە دەڵێ مێژوو لە گەشە و بەرەوپێشچووندایە بۆ ئۆگۆستین دەگەڕێتەوە.

## بەکورتی:

مرۆ لە پلەی خـوارەوەی بوونەوەرە ئاسمانیەکاندا قەراری گرتووە، بەڵام لەهەمان کاتدا بەشکۆترین بوونەوەری خوڵقاندنە. ئینسان تەنیا بوونەوەرێکی بیریار نییە، بەڵکو رۆحیشە. واتە توانای ناسینی خودایشی هەیە. ناسینی خودا بریتی نییە لە زانستی ئێمە سەبارەت بە خودا، بەڵکو بریتیە لە توانای خۆشەویستی ئێمە بۆ خودا. هۆکاری گوناح لە کەمیی خۆشەویستیدایە بۆ خودا. بزربوونی خۆشەویستی سەرچاوەی نافرمانیە. مرۆڤ دەبێ لەبەر رەزای خودا مرۆ و خودای خۆش بوێت. ئەوانەی خودایان خۆش دەوێت شارۆمەندی دەوڵەتی خودان و ئەوانەیشی خۆشیان ناوێت شارۆمەندی دەوڵەتی زەوی. لەسەر زەوی ململانێیەکی درێژخایەن لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتەدا لەئارادایە کە بە کۆتایی جیهان و سەرکەوتنی دەوڵەتی خودایی کۆتایی دێ. ئەم بۆچوونەی ئۆگۆستین کە دەڵێ دنیا خاوەن سەرەتا و کۆتاییە، لەچاو بیری سەردەمی کۆن (یۆنان) بۆچوونێکی تازەیە.

---

1- Aprioriske bevis

2- Aposterioriske bevis

## چۆنیەتی پێکەوە گرێدانی مەسیحیەت و فەلسەفە لای توماس ئەکویناس. تێگەیشتنی وی لە توانای سروشتیانەی ناسین لای مرۆڤ.

1.لە سەدەکانی یازدە و دوازدەی زاییندا بەرهەمەکانی ئەرەستو لە ئەورووپای رۆژئاوادا ناسران. لەراستیدا لای بیرمەندان ئەوەندەی لێک گریدانی ئەفلاتوون بە بیری مەسیحیەوە ئاسان دەینواند، لێک گرێدانی ئەرەستو ئاسان نەیدەنواند. هۆکاری ئەمە بە دەرەجەی یەکەم بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە ئەرەستو لە سێ بواردا لەگەڵ روانگەی مەسیحی ناتەبا بوو: ئەلف) ئەرەستو پێی وابوو کە جیهان بوونێکی ئەزەلی و ئەبەدییە، واتە کەس نەیخوڵقاندووە. ب) رۆح لەگەڵ جەستە دەمرێ. واتە رۆح لەدوای مردنی جەستە ناتوانێ بژی. پ) ئەو خودایەی ئەرەستو باوەڕی پێی هەیە بە دوورە لە وێنای خودایەکی خوڵقێنەر و خودایەک کە دەتوانێ لە دەرەوەی جیهان بوونی هەبێ.

سەبارەت بە روانگەی یەکەم ئەکویناس دەڵێ کە ناتوانین بەشێوەی فەلسەفی تێی بگەین، بەڵام سەبارەت بە دوو روانگەکەی دیکە هەوڵ دەدا کە بەگوێرەی بۆچوونی مەسیحیانە لێکیان بداتەوە.

2. نەمریی رۆح: ئەرەستو پێی وایە کە فۆرم و تۆز لای مرۆ بریتین لە رۆح و جەستە، بەڵام فۆرم ناتوانێ سەربەخۆ بوونی هەبێ. کەواتە رۆح فۆرمێکی نەمر نییە. ئەرەستو هەروەها توانا رۆحیە جۆربەجۆرەکان لە رووەک و ئاژەڵ و مرۆدا لێک دەداتەوەو پێی وایە هەر کامیان لە توانای رۆحیی تایبەت بە خۆیان بەهرەمەندن. ئەرەستو پێی وایە کە هەر توانایەکی رۆحی لەگەڵ ئەو بەشەی جەستەدا دەگونجێ کە پێکەوە دێنەوە (بۆ وێنە دیتن کە توانایەکی رۆحییە تایبەتە بە ئۆرگانی چاو). هەروەها بە بۆچوونی ئەو بیرکردنەوەش توانایەکی رۆحی وابەستە بە ئۆرگانێکی جەستەیە. بابەت و مەتریالەکانی بیرکردنەوە لە رێگای هەستەوە دەستەبەر دەکرێن (هوشیاری لە بنەڕەتدا و لە خاڵی دەستپێکی خۆیدا وەک تەختە رەشێکە هیچی لەسەر نەنووسرابێت)، بەڵام هەر لەو کاتەدا ئەرەستو باس لەوە دەکا کە رەنگە فۆرمێک بۆ بیرکردنەوە هەبێ، کە مەبەستیشی لەمە ئەو توانایەیە کە دەبێتە هۆی بیرکردنەوە (هۆکاری بیرکردنەوە). بەرای وی "هۆکاری بیر" نەمر و ئەبەدییە. زۆربەی راڤەکاران پێیان وایە کە مەبەستی ئەرەستو ئەوەیە کە ئەمە لەنێوان مرۆڤەکاندا هاوبەشە و دیاردەیەکی تاکە کەسی نییە. مەسیحیەت بڕوای بەوەیە کە رۆحی تاکەکەس نەمرە. لێرەدا ئەکویناس ئەم بۆچوونەی ئەرەستو وا لێک دەداتەوە کە "هۆکاری بیر" تاکەکەسیە و بەڵام

هەر لەو کاتەدا ئەبەدی و نەمرە. واتە ئەگەرچی لای ئەرەستو "هۆکاری بیر" تاکەکەسی نەبوو، بەڵام ئەکویناس خەسڵەتی تاکە کەسیانەی پێ دەبەخشێ. لای ئەرەستو بە مردنی مرۆ هەم جەستە و هەم رۆح دەمرن، بەڵام لای ئەکویناس رۆح چونکە پەیوەندی بە "هۆکاری رۆح"ەوە هەیە، سەرەڕای تاکە کەسی بوونی، نامرێ.

3.بوونی خودا: ئەرەستو لەسەر "جوڵێنەری بێ جوڵە" قسە دەکا، کە دەستەواژەیەکی گەلێک ناڕوونە، بەڵام ئەرەستو مەبەستی پتر لەمە ئەو وزەیە کە شتێک دەخاتە جوڵە و حەرەکەت لە زنجیرەیەک رووداودا کە هەرکامیان دەشێ هۆکاری ئەوی دیکەیان بێت. ئەکویناس ئەم بۆچوونە وا لێک دەداتەوە کە ئەمە ئێمە دەباتەوە سەر یەکەمین جوڵێنەر، واتە ئەو بوونەوەرەی یەکەمین هۆکاری هەموو جیهانە. لە درێژەی ئەمەدا دەڵێ کە ئەمە رێک ئەو پرسیارەیە کە باسی خوڵقێنەری سروشت دەهێنێتە ئاراوە. ئەکویناس پێی وایە کە ئەرەستو وێنایەکی لەسەر خودا وەک یەکەمین هۆکاری هەموو شتێک هەیە، واتە ئەو وێنایەی کە لەگەڵ خودای مەسیحیدا دێتەوە.

4. تێگەیشتنی توماس لە توانا سروشتیەکانی ناسین لای مرۆ: توانای سروشتیانەی ناسین لای

مرۆ لەم دوو بەشە پێک هاتووە: هەست و بیر. توماس وەک ئەرەستو پێی وایە کە وشیاری مرۆ سەرەتا دەبێ سەرچاوەی زانیاریەکانی خۆی لە هەستەکانەوە دەستەبەر بکا. بەبێ هەستەکان مرۆ هیچی بۆ بیرکردنەوە پێ نییە. وشیاری بەبێ هەست تەختەرەشێکە کە هیچی لەسەر نەنووسرابێ. وشیاری ئەگەرچی بەبێ شتە بەرهەستەکان هیچی نییە، بەلام شتە بەرهەستەکان تەنیا کەرەسەی خاون بۆ بیرکردنەوە. وشیاریی مرۆ ئەم کەرەسە خاوانە دەکا بەو وێنایانەی خەسڵەتی وشیاریان دەخرێتە پاڵ. واتە وشیاری مرۆ دەتوانێ ئەمانە لە وێنا هەستیەکانەوە بەرەو ئەو وشە و دەستەواژە گشتیانە راگوێزێ کە پێکهێنەری پرۆسە و رەوتی بیری ئابستراکتیانەن. لێرەدا ئیدی مرۆ لە رێگای ئەبستراکتەوە فۆرم لە تۆز جیا دەکاتەوە.



## بەکورتی:

ئەکویناس بە پشت بەستن بە دەقێکی ئەرەستو پێی وایە کە رۆح نەمر و ئەبەدییە. ئەو پێی وایە کە "جوڵێنەری بێ جوڵە"ی ئەرستو، یەکەمین هۆکار یاخود خوڵقێنەری هەموو جیهانە و ئەم دەستەواژەیە لەگەڵ خودای مەسیحی دەگونجێنێ. توانا سروشتیەکانی ناسین لای مرۆ بریتین لە هەست و عەقڵ. عەقڵ لەسەر ئەو کەرەسە خاوانە کار دەکا کە هەست پێی دەدا و دواتر دەتوانێ وشە و دەستەواژە گشتیەکانی لەسەر بنیات بنێ. وێنا عەقڵیەکان تەواو جیاوازن لە وێنا هەستیەکان.

## چۆنیەتی جیابوونەوەی زانستی سروشت و فەلسەفە لە میتۆلۆژی، لە قۆناغی گواستنەوە لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە بۆ قۆناغی نوێ. جیاوازیی نێوان ریالیزم و نومینالیزم.

1. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا تیۆلۆژی هەموو زانستەکانی لەخۆ دەگرت. ئەوکات زۆربەی بیرمەندان وایان بیر دەکردەوە کە فەلسەفە بەکەڵک و بەنرخە، بەڵام دەبێ لە خزمەت تیۆلۆژیدا بێت. ئەم بۆچوونە هەموو بەشەکانی زانست بۆ وێنە زانستی پزیشکیشی دەگرتەوە. زانستی پزیشکی لەلایەن تیۆلۆگەکانەوە چاوەدێریی دەکرا. لە هەموو بوارەکانی زانستدا دەبا ئەو بابەتانەی لەگەڵ ئایین ناتەبا بوون، سانسۆر کرابان، بەڵام بەرەبەرە لەگەڵ گەشەی زانست، لە کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا هاوکاری نێوان کلیسا و زانست (بڕوا و زانست) تا دەهات دژوارتر و دژوارتر دەبوو، بەشێوەیەک کە لە سەدەکانی شانزدە و هەڤدەدا شەڕێکی دژوار لەنێوانیاندا هەڵگیرسا (بۆ نموونە بڕوانە جوردانو برۆنۆ و گالیلە).

2. لە سەدەی سێزدەی زاییندا توماس ئەکویناس سێنتێزێکی syntheseلە هەموو ئەو زانستە گرنگانە پێشکەش کرد کە لە خانەی تیۆلۆژیدا خۆیان دەبینیەوە. ئەم حاڵەتە ئیدی لە سەدەی چواردە

بەولاوە وەک خۆی نەما و زانستەکان روویان لە لێکجودا بوونەوە کرد. ئاکامی ئەمە سەرهەڵدانی دوو گۆرەپانی تیۆلۆژی و فەلسەفە بوو. بەڵام فەلسەفە هەتا سەدەی هەژدە بەردەوام مەکۆی زۆربەی زانستە سروشتیەکان بوو (فەلسەفەی سرووشت). لێکۆڵەران و زانایان ئیدی ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی خۆیان سەربەست لە تیۆلۆژی و کلیسا دەهێنایە گۆڕێ (بۆ وێنە تیۆلۆگەکان دژی روانگەی خۆر-ناوەندی بوون و وەک راستیەک چاویان لێنەدەکرد. دەیانگوت ئەمە تەنیا گریمانەیەکی ماتماتیکیە).

3. ئەو فاکتۆرانەی دیکە کە بوونە هۆی لێکجودابوونەوەی تیۆلۆژی و فەلسەفە، هەر هەمان ئەو هۆکارانەن کە بوونە هۆی سەرهەڵدانی رێنسانس. هەروەها ئەم فاکتۆرانە پەیوەندییان هەیە بە کۆمەڵێک گۆڕانی کۆمەڵایەتی و ئابووری. واتە گۆڕان لە کۆمەڵگای کشتوکاڵی بەرەو کۆمەڵگایەکی پیشەسازی، زۆر بوون و گەورەبوونی شارەکان، بازاڕەکان و شتی لەم بابەتە. ئەم ئاڵوگۆڕانە داواکاریی تەکنیکیی نوێ ئاراستەی لێکۆڵەران دەکەن.

4. لە سەدەی هەڤدەوە کۆمەڵێک جیابوونەوە لەناو فەلسەفەدا روودەدات کە لە ئەنجامدا زانستگەلی وەک فیزیا، ماتماتیک کیمیا و ژینناسی دەبنە خاوەن کەسایەتی سەربەخۆی خۆیان. ئەم زانستانە ئیدی

دەبنە خاوەن پرنسیپ و میتۆدی تایبەت بە خۆیان. ئیمپیریزم (ئەزموونگەرایی) و لێکۆڵینەوەی پشت ئەستور بە تاقیکردنەوە، تایبەتمەندیی ئەم قۆناغەن. ئەمە جودایە لە میتۆدی فەلسەفە کە تێیدا لێکۆڵینەوە لە ڕێگای ڕاڤە، ڕەخنە و هەڵسەنگاندنەوە ڕوودات (بەپێچەوانەی ئیمپیریزم واتە ئەزموونگەرایی).

5. نومینالیستەکان دەیانگوت کە مرۆ ناتوانێ ببێ بە خاوەنی ئایدیا هاوبەشە ڕوونەکان، بەڵام لەجیاتی ئەمە مرۆ دەتوانێ خاوەنی ناوی هاوبەش، یاخود وشە بێت (nomen) مەسیحیەکان بیروبۆچوونی نومیانالیستەکانیان بە جێی مەترسی دەزانی. بۆ وێنە ئەگەر شتێکی هاوبەش لەنێوان خودا، کوڕ و ڕۆحی پیرۆزدا نەبێ، چلۆن دەکرێ بڵێین کە ئەم سیانە لەڕاستیدا یەک شتن (ئایینی مەسیحی ئەم سیانە لەڕاستیدا بە یەک بوونەوەر دەزانێ. (Treenighetslæren

## بەکورتی:

لە سەدەکانی ناوەڕاست تیۆلۆژی هەموو زانستەکانی لەخۆ دەگرت. لە سەدەی سێزدەی زایینەوە ئەو بەشانەی لێ جیا دەبنەوە کە پەیوەندیان بە ئایینەوە نەبوو، وەک فەلسەفە. لە سەدەی شازدەوە کۆمەڵێک زانست بە میتۆد و پرینسیپی تایبەت بە خۆیانەوە لە فەلسەفە جودا دەبنەوە. هۆکارێکی دیکەی لێکجودابوونەوەی فەلسەفە لە تیۆلۆژی ئەو گۆڕانە ئابووری و کۆمەڵایەتیانەن کە دواتر دەبنە هۆی سەرهەڵدانی رێنسانس. نومینالیسمیش تیۆرێکە کە دەچێتە بەربەرکانێی دۆگما مەسیحیەکان و هەوڵی ناشتنیان دەدات.

## بیروبۆچوونە نوێیەکانی هۆبز و ماکیاڤیلی لە بابەت مرۆ، کۆمەڵگا و دەوڵەتەوە

1. هیومانیزمی سەردەمی ڕێنسانس دەیویست ئەو بایەخانە لە کۆمەڵگادا بچەسپێنێ کە ئەو دەرفەتەیان بە مرۆ دەدا وەک بوونەوەرێکی سروشتی بژی. لای هیومانیستەکان ژیانی سەر زەوی لە ژیانی ئاسمانەکان بایەخی زیاتری هەبوو. ئاکامی بە کردەوەی ئەم بۆچوونە ئەوە بوو کە مرۆ ئیدی کەمتر سەرنجی دەدایە ژیانی گۆشەنشینی و دەستکێشانەوە لە لەزەتەکانی دنیا. هیومانیستەکان ئەم بۆچوونەیان دەدایە بەر ڕەخنە و هێرش لە بابەت ئەوەی کە گوایا مرۆ بوونەوەرێکی گوناهبارە. بەرای وان هیچ شتێکی مرۆ خۆی لە خۆیدا خراپ و سەرچاوەی کرداری ناشایست نەبوو. بۆ ئەوان ئەوە گرنگ بوو کە "مرۆڤ چۆنە"، نەک ئەوەی "دەتوانێ چلۆن بێ". کۆمەڵگا وەک کۆی تاکەکان سەیر دەکرا. کەواتە زانست لەمەڕ کۆمەڵگا بریتی بوو لە زانست لە بابەت سروشتی تاکەکانەوە. ئیدی بەم پێیە کۆمەڵگا دەبوو بە شوێنی کێشە و کێبەرکێی نێوان تاکەکان، جا بۆ بەرگریکردن لە ئاسەوارە زیانبارەکانی ئەم دیاردەیە دەبا دەوڵەتێکی بەهێز لە گۆڕێدا بایە.

2. ریالیزمی ڕێنسانس کلیلی تێگەیشتن لە تیۆرە

سیاسییە نوێیەکانە. سیاسەت ئیتر باسی مرۆ بوو بە چاکە و خراپەکانیەوە. پرسیاری گرنگ لای ماکیاڤیلی بریتی بوو لەوەی کە داخۆ دەبێ ئامانجی پیاوی دەسەڵاتدار چ بێت؟ هەر بۆ خۆیشی وەڵامی دەدایەوە کە: "ڕاگرتنی دەوڵەت و بەهێزکردنی". لای وی ئەم ئامانجە پاساوی هەموو ئەو ئامرازانە دەداتەوە کە بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنران. تەنانەت ئەمە ئەو ئامرازانەش دەگرێتەوە کە لە سۆنگەی مۆراڵەوە جێی پەسەند نین. بۆ وێنە درۆ، کوشتن، فێڵ و دووڕوویی، بەڵام بۆچی کەڵک وەرگرتن لە ئامراز و کردە نامۆڕاڵییەکان پێویستن؟ چونکە مرۆ خۆویستە و بە شوێن سێ شتەوەیە: سەروەت و سامان، دەسەڵات و ناوبانگ. گرنگترین جیاوازیی نێوان مرۆ و ئاژەڵ ئەوەیە کە مرۆ بەهۆی توانای بیرەوە دەتوانێ لە خەفادا کەڵک لەو ئامراز و ڕێگایانە وەرگرێ کە دەتوانن یارمەتی بدەن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی. ئەمە لە کاتێکدایە کە ئاژەڵ توانای ئەمەی نییە. سیاسەتڤان دەبێ هەم لە یەک کاتدا ئاژەڵ بێت و هەم مرۆ. سیاسەتڤان دەبێ توانای تێکەڵاوکردنی خەسڵەتەکانی ئاژەڵە جۆربەجۆرەکانی هەبێ. بۆ وێنە لە ڕێویەوە فرت و فێڵ فێر بێت و لە شێرەوە هێز و هەیبەت. کتێبی شازادەی ماکیاڤیلی کتێبی خۆشەویست و جێ متمانەی دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمە بوو. بۆ وێنە دوو دەسەڵاتدار کە ناویان Lorenzo و Firenzes بووە.

3. هۆبز لە هەمان ئەزموونی ماکیاڤیلی لە بابەت مرۆڤەکانەوە دەست پێدەکا. مرۆ بە بێ دەسەڵاتێکی بانی سەر وەک ئاژەڵ دەژی. لە دۆخێکی وادا ژیان بریتی دەبێ لە ژیانێکی پڕ لە تەنیایی، هەژاری، ئاژەڵ ئاسا و کورت. لەراستیدا وەها دۆخێک دەبێ بە شەڕی هەموو لە دژی هەمووان. هۆبز ئەم دۆخە ناو دەنێ "دۆخی سروشتی". لە دۆخێکی وەهادا لە درێژخایەندا کەس ناتوانێ براوە بێت. چونکە هەموو لە دۆخێکی نامتمانە دەژین و کەس بڕوای بەوی دیکە نییە.

4. بۆیە بۆ چێکرنی دۆخێکی دڵنیا و متمانەپێکراو، هەموو سەرئەنجام دێنە سەر ئەو رایەی پەیمانێک لەناو خۆیاندا بۆ کۆتاییهێنان بەم دۆخە نالەبارە مۆر بکەن (کۆمەڵگا). لەم پەیمانەدا هەموو مافەکان جگە لە مافی ژیان و ئەستاندنی دەدرێتە دەست کەسێک. ئەم کەسە دەبێ بە خاوەن دەسەڵاتێکی رەها بەسەر ئەوانی دیکەدا. دەسەڵاتدار جاروبار ئەو مافەی هەیە کە هەر کەسێک پێی خۆش بێت بکوژێ، بەڵام هەر لەو کاتەدا ئەم کەسە دەتوانێ لە هەموو ئامرازەکان بۆ پاراستنی گیانی خۆی کەڵک وەرگرێ.

## بەکورتی:

لە سەردەمی ڕێنسانسدا مرۆ بە مەبەستی سەرلەنوێ لەدایکبوونەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی سەردەمی کۆن. بۆئەوەی بە کەڵک وەرگرتن لەم سەرچاوانە دالّدە و یارمەتی بیرە نوێیەکانی خۆی بدا. مرۆ لەم سەردەمەدا هیومانیزم دێنێتە ئاراوە کە بە مانای پێداگرتن و بڕواهێنان بە بایەخی مرۆڤ و ژیانیەتی. لای ماکیاڤیلی ڕاگرتنی دەسەڵات، بنەڕەتیترین پرس بوو. بۆیە بۆ ئەم مەبەستە هەموو ئامرازەکانی بە ڕەوا دەزانی. هۆبز لەوەدا لەگەڵ ماکیاڤیلی هاوڕا بوو کە "دۆخی سروشتی" بە مانای شەڕی مرۆ لەگەڵ مرۆیە. هەر بۆیە مرۆڤ دەبێ پەیمانێک لەناو خۆیدا ببەستێ و لەم پەیمانەدا هەموو مافەکان بۆ دەسەڵاتدار جێبێڵێ. لە دۆخێکی وادا ئەوسا مرۆ دەتوانێ دۆخێکی متمانەپێکراو بۆ درێژەدان بە ژیانی دەستەبەر بکا.

## کورتەیەك لەهەر جیهانبینیي کپلێر، گالیلە و نیۆتۆن کە درێژەدەری جیهانبینیي کۆپرنیکۆس بوون. جیاوازییەکانی نێوان تیۆری تیۆلۆژی و تیۆری میکانیستی.

1ـ بەکورتی دەتوانین بڵێین کە خاڵی شۆڕشگێرانە لە بیروبۆچوونی نوێدا بریتی بوو لەو جیهانبینییە نوێیەی پێشکەشی دەکرد، واتە گۆڕان لەو جیهانبینیەوە کە دەیگوت زەوی سەنتەری دنیایە بەرەو ئەو جیهانبینیەی هەتاوی وەک سەنتەر دەبینی. ئەم گۆڕانە لە بنەڕەتدا پەیوەندیی هەبوو بە گۆڕان لە فیزیادا، واتە گۆڕان لە جیهانبینیی ئەرەستۆییەوە بەرەو جیهانبینیی میکانیکیستیانە. جیاکردنەوەی ئەم دووانە لە یەک یەکجار گرنگە.

2ـ پرسیارێکی ئەستێرەناسانە: شوێنی زەوی لە جیهاندا لەکوێیە؟ پرسیارێکی فیزیکی: شتەکان خاوەنی چ خەسڵەتگەلێکی بنەڕەتین؟ ئەرستۆ دەیگوت کە شتەکانی سەر زەوی لە خەسڵەتدا بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەگەڵ شتەکانی ناو ئاسمان جیاوازییان هەیە، بەڵام فیزیکی میکانیستی دەیگوت کە هەر هەموویان لە یەک جۆرن. تۆز لە هەموو جیهان هەر هەمانە، هەر بۆیە یاساکانی ناو سروشتیش لە هەموو شوێنێ وەک یەکن.

3. شۆڕش لە زانستی سروشتناسیدا لە دوو ئاستدا روویدا: ئەلف) لە بواری ئەستێرەناسیدا: لە سەدەی پازدەدا بەهۆی کۆپرنیکۆسەوە گۆڕان لە زەوی - سەنتەری بەرەو خۆر - سەنتەری روویدا. ب) لە بواری فیزیادا کە کپلێر، گالیلە و نیۆتۆن لە سەدەی شازدەدا هێنایانە ئاراوە. ئەمە بە مانای گۆڕان لە جیهان بینیی ئەرەستۆییەوە بەرەو فیزیکی میکانیکی و سروشتناسی بوو. بواری دووهەم گرنگترە، چونکە بەو مانایە بوو کە ئیتر شتە ئاسمانیەکان و جولەیان بەگوێرەی تیۆری فیزیای کۆنەوە راڤە نەدەکران.

4. بەگوێرەی فیزیای ئەرەستۆیی، شتە ئاسمانییەکان لە ئیلەمێنتێکی روون چێکرابوون کە لەسەر زەوی پەیدا نەدەبوو. شتە ئاسمانییەکان لە بازنەیەکی تەواودا لە جولەدا بوون. ئەم بازنەیە خاوەن فۆڕمێکی خڕ بوو و لە مەزنیی خواوەند بەهرەی هەبوو، کەواتە لە دەرەوەی بازنەی تێگەیشتنی مرۆدا بوو. جا دەبا مرۆ تەنیا پێی سەرسام بایە و وەک سیمبۆلێک لە گەورەیی و مەزنیی خودا سەیری کردبا. ئەمە لەراستیدا بۆچوونی باوی سەدەکانی ناوەڕاست بوو.

5. کۆپرنیکۆس سیستەمی خۆر - سەنتەری تەنیا وەک گریمانەیەکی ماتماتیکی چاو لێدەکرد. دواتر

که بیریارانی دیکه له سەدەی شازدەدا پێیان لەسەر ئـەوە داگـرت کە ئـەم گریمانەیە راستەو دەربـڕی راستەقینەی جیهانی ئێمەیە، لەلایەن پاپی ڤاتیکانەوە رەفز کرایەوە و درایە بەر هێرش. هەر لەم ماوەیەشدا فیزیای نوێ بەرەبەرە گەشەی سەند و پێشکەوتنی پتری بەخۆیەوە بینی.

6. کارلێکەریەکانی کپلێر: ا) تیۆری ئەستیرەناسی نابێ تەنیا وەک گریمانەیەک سەیری بکرێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێ ئەو داوایـەمـان لێی هەبێ کە پێشکەشکەری وێنایەکی راستەقینە لە جیهان بێ. ب) ئەگەر زەوی سەنتەری جیهان نییە، کەواتە سروشت و یاساکانی زەوی لە سروشت و یاساکانی جیهان ناتوانێ جودا بێ. پ) خێرایی جوڵەی هەسارەکان پەیوەندیی بە مەودای وانەوە هەیە بە هەتاو. (کپلێر خاوەن سێ تیۆرە کە یەک لەوان باس لەوە دەکا کە هەسارەکان لە بازنەیەکی هێلکەییدا بە دەوری هەتاودا دەسوڕێنەوە). ت) هەسارەکان خۆیان جوڵێنەری خۆیان نین، بەڵکو لەژێر سریمەی ئەو هێزانەدان کە بەهۆی دووری و نزیکییانەوە لە شتەکانی دیکە کاریان لەسەر دەکا. ئاکام: هەسارەکان وەک دەگوترا کامڵ و بێ عەیب نین. ئەوان لە زەوی دەچن و خاوەن هەمان ئەو تایبەتمەندییانەن کە زەوی هەیەتی.

7. کارلێکەرییەکانی گالیلە: ا) شتەکان چ لەسەر زەویەکی خاوەن جوڵەدا بن یان بێ جوڵە، بە یەک شێوە هەڵسوکەوت دەکەن. ب) بە یارمەتیی تلیسکۆپ سەلماندی کە ڤینۆس دەگۆڕدرێ، جاری وایە گەورە دەنوێنێ و جاری وایشە بچووک. هۆکارەکەیشی ئەوەیە کە هەم زەوی و هەم ڤینۆس بە دەوری هەتاودا دەسوڕێنەوە. پ) شتەکانی ناو ئاسمان کامڵ و بێ عەیب نین: مانگ بەرز و نزمیی هەیە و هەتاویش پەڵەی تێدایە. ئاکام: هەسارەکان لە هەمان خەسڵەتگەلی زەوی بەهرەمەندن و زەویش لە هەمان خەسڵەتگەلی وان. بەڵام گالیلە نەیتوانی وەڵامی ئەوە بداتەوە کە بۆچی زەوی دەگەڕێ.

8. بە یارمەتیی "یاسای هێزی راکێشان" نیۆتۆن وەڵامی ئەوەی دایەوە کە بۆچی لە جیهاندا جوڵە هەیە. یاساکانی جوڵەی وی لە یەک کاتدا هەم وەڵامدەری جوڵە لەسەر زەوی بوون و هەم جوڵەی ناو ئاسمان. هێزی راکێشان دەتوانێ بۆمان روون بکاتەوە کە بۆچی مانگ بە دەوری زەویدا دەسوڕێتەوە و بۆچی سێو کە لە درەخت بەردەبێتەوە دەکەوێتە سەر زەوی. لەنێوان شتەکان لەراستیدا هێزی راکێشان هەیە. دەتوانین بیری نوێ لێرەدا بەم شێوەیە کورت بکەینەوە: ا) شتە فیزیکیەکان لە هەموو جیهاندا لە هەمان تایبەتمەندی بەهرەمەندن. ب) لەبەرئەوەی سروشت یەک جۆرە، بۆیە یاسا

سروشتیەکانیش لە هەموو جیهاندا یەکن. پ) یاسا سروشتیەکان روونکەرەوەی دیاردە سروشتیەکانی جیهانی نازیندوون.

9. مەبەست لە تێگەیشتنی میکانیکیانەی سروشت ئەوەیە کە: سروشت وەک ماشینێک وایە و دەکرێ وەک ماشینێک لێک بدرێتەوە. مەبەست لە ماشێن فنۆمێنێکە کە لە چەند بەش پێک هاتووە و بەشەکانیش لەسەر یەکتر کارتێکەرییان هەیە، بەشێوەیەک کە بەشێک دەتوانێ بەشەکانی دیکە بخاتە جوڵەوە. لە تێگەیشتنێکی هەرەمەکیدا جیهانی راستی لە تۆز پێک هاتووە و هەر جوڵەیەکیش بەهۆی کارتێکەریی دەرەکییەوەیە.

10. بەو بۆچوونەی دەڵێ جیهانی راستی تەنیا لە تۆز (مەتریاڵ) پێک هاتووە، دەگوترێ مەتریالیزم (ئەم مەتریالیزمە جیاوازیی هەیە لەگەڵ مەتریالیزمی مارکس). ئەم بۆچوونە دەرخەری گرنگترین جیاوازیی ئەم روانگەیە لەگەڵ روانگەی ئەرەستویی. ئەرەستو پێی وابوو شتەکان لە تۆز و فۆرم پێک هاتوون و ئەوە فۆرمە کە دیاریکەری جوڵە و گۆڕانە، بەڵام میکانیستەکان دەیانگوت کە شت تەنیا لە تۆز دروست کراوە و خەسڵەتی بنەڕەتیی تۆزیش نەجوڵانە (اینرسی یان treghet)، واتە شت بەهۆی دۆخیەوە لە دژی گۆڕانە، بەڵام کارتێکەرە

لەسەر شتەکانی دی و هەر بۆیە دیاریکەری هەموو جۆرە گۆڕان و جوڵەیەکە. بیرمەندێک روانگەی میکانیستیانە بەم شێوەیە فۆرمولە دەکا: ا) کارتێکەریی میکانیستیانە: تەواوی ئەو شتانەی لە سروشتدا روودەدەن دەبێ بەهۆی ئەو هێزانەوە شی بکرێنەوە کە بەشێوەی میکانیکیانە کار دەکەنە سەر شتەکان (جا ئەم کارتێکەرییە چ بەهۆی وێککەوتنەوە بێت، یان لە رێگای دوورەوە). هەر پرۆسەیەک دەبێ بەسەر زنجیرەی هۆکارەکاندا دابەش بکرێ و هەر گۆرانێک بریتیە لە کارتێکەریی نێوان دوو شتی جیاواز (بۆ وێنە کارلێکەریی نێوان زەوی و مانگ، یاخود کاتێک کەللای A کەللای B دەجولێنێ). ئەمە هەروەها بوونەوەرە گیانلەبەرەکانیش دەگرێتەوە (ئەرەستو گۆڕان لە ئۆرگانیسمە زیندووەکاندا بە یارمەتیی هۆکاری مەبەستەوە لێک دەداتەوە، واتە بەهۆی سروشتی بوونەوەرەکەوە). ب) لە سروشتدا تەنیا خەسڵەتە سەرەتاییەکان بوونیان هەیە. ئەوەی تەنیا لەراستیدا تۆز (مەتریاڵ) بوونی هەیە، ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ کە شتەکان دەبێ لە چ تایبەتمەنییەک بەهەرەمەند بن بۆئەوەی وەک تۆز رەچاو بکرێن؟ ئەو خەسڵەتانە چین کە بەبێ ئەوان شتەکان ناتوانن بوونیان هەبێ؟ وەڵام بریتیە لە خەسڵەتە بنەڕەتی یاخود سەرەتاییەکان، واتە ئەو خەسڵەتانەی سروشت هەیەتی، بەدەر لەوەی مرۆ هەستیان پێ بکا یان نا. بەدوای ئەمەدا خەسڵەتە

پله دووهەمەکان دێن (وەک بۆن، رەنگ، تام، دەنگ و هەستی ئینسانی) کە لە سروشتدا نین و تەنیا دیاردەگەلێن کە لە هەستی مرۆڤەکاندا روودەدەن و بوونیان نییە. سروشت تەنیا خەسڵەتگەلی وەک ئەندازە، فۆرم، جوڵە، ژمارە و شوێنی هەیە. ئەم خەسڵەتانە لەهەمان کاتدا دەتوانرێ ئەندازەیان دیاری بکرێ و بە زمانی ماتماتیک بەیان بکرێن. پ) تەنیا گۆڕانێک کە هەیە بریتیە لە گۆڕان لە شوێندا. بۆ وێنە گۆڕان لە رەنگی گەڵای درەختدا دەتوانین بەم شێوەیە لێک بدەینەوە: دەنکە تۆزییەکانی (بۆ وێنە ئێلەمێنتە کیمیاوییەکان)ی گەڵاکە بەشێوەی تر لەگەڵ یەکتردا پەیوەندی دەگرن. ئەم گۆڕانە بریتیە لە گۆڕانی شوێنی دەنکە تۆزییەکان لەبەرامبەر یەکتردا. (رەنگ لە سروشتدا روو نادات، بەڵکو تەنیا دەبێ لە رێگای خەسڵەتە سەرەتاییەکانەوە لێک بدرێتەوە). ت) تۆز و جوڵە بەتەواوی بوونی راستەقینەیان هەیە. لای ئەرەستو تۆز ئیمکان و دەرفەتێک بوو کە فۆرم بوونی پێ دەبەخشی. بەڵام لای میکانیستەکان تۆز تەنیا بوونی راستەقینەیە کە قەت نافەوتێ. تۆز ناگۆڕێ، تەنیا شوێن دەگۆڕێ (بۆچوونەکانی ئەرەستو زۆرتر جیهانی گیانلەبەران دەگرێتەوەو بۆچوونی میکانیستیش جیهانی ناگیانلەبەران). ج) جیهانی راستەقینە دەتوانرێ بە زمانی ماتماتیک بەیان بکرێ. ئەمە پەیوەندی بەو بۆچوونە میکانیستیانەوە هەیە کە دەڵێ لە دنیای راستەقینەدا تەنیا خەسڵەتە

سەرەتاییەکان هەن، واتە ئەو تایبەتمەندییانەی دەکرێ بپێورێن و ئەندازە بگیرێن (گالیلە دەڵێ کتێبی سروشت بە زمانی ماتماتیک نووسراوە). چ) تۆز، لە هەموو شوێنێک یەک جۆرە. یاسا سروشتیەکانیش، جیهانین. یاسا بنەڕەتیەکانی جوڵە، بۆ هەموو شتەکان لە هەر کوێیەک و لە هەر فۆڕمێکدا بن یەکە.

## بەکورتی:

گۆڕان لە ئەستێرەناسی و فیزیادا دوو لایەنی گرنگی شۆڕشی زانستی لە سەدەکانی پازدە و شازدەدا بوون. بەبۆنەوە هەم وێنای مرۆ لە جیهان گۆڕانی بەسەردا هات و هەم خەسڵەتی فیزیکیی شتەکان. کۆپرنیکوس گریمانەی خۆر ـ سەنتەری هێنایە ئاراوە. کپلێر سەلماندی کە زەوی هەسارەیە. گالیلە وتی زەوی هەسارەیەکە وەک هەسارەکانی دی بەهەمان خەسڵەتەوە. نیۆتۆنیش لە ڕێگای تیۆری هێزی ڕاکێشانەوە، جوڵەی ناو جیهانی شی کردەوە.
جودایی نێوان تیۆلۆژی و جیهانبینیی میکانیستیانە، سەرەتای جیاوازیی نێوان ئەو دوو بۆچوونە بوو کە یەکیان جیهانی وەک ئۆرگانیسمێک دەبینی و ئەوی دیکە وەک ماشین.
تۆز تەنیا راستیەکە کە هەیە. چوار هۆکارەکەی ئەرەستو کەم کرایەوە بۆ دوو هۆکار: هۆکاری کارتێکەر و هۆکاری تۆزی. هەڵبەت ئەمەی دووهەم چیدی وەک هۆکار سەیری ناکرێ و تەنیا بنەمایەکە بۆ ئەو شتانەی ڕوودەدەن. ڕوانگەی میکانیستی لەناو سروشتدا تەنیا بـاوەڕی بە خەسڵەتە سەرەتاییەکان هەیە.

**بۆچوونی دیکارت لە بابەت میتۆد. چۆنیەتی گەیشتنی وی بە رستەی "من بیر دەکەمەوە، کەواتە هەم". بەڵگەی سەلماندنی خودا، تیۆری دوو سوبستانس و چۆنیەتی پەیوەندیی نێوان رۆح و جەستە. روانینی وی سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان هەست و بیر.**

1) دیکارت لە میتۆدی ماتماتیکی بۆ حەللی پرسە فەلسەفیەکان کەڵکی وەردەگرت. میتۆدی ماتماتیکی (بۆ وێنە ئەندازیاری) لە شتە هەرە سادەکانەوە دەست پێدەکا و دواتر لە رێگای سێنتێزەوە راستیە ئاڵۆز و دژوارەکان بنیاد دەنێ. فەیلەسووفەکانیش بە پرسێکەوە دەست پێدەکەن، واتە پرسێک کە ئاڵۆزە و مرۆ سەرەتا دەسەڵاتی بەسەردا ناشکێ. جا لێرەدا لە رێگای ئانالیزەکردنی پرسەکەوە فەیلەسووف دەتوانێ بە راستییە روونەکان یاخود شتە سادەکان بگات (فەیلەسووف دیاردە ئاڵۆزەکە بەسەر چەند بەشی سادە و روونا دابەش دەکا). لێرەدا دەبینین کە میتۆدی ماتماتیک و فەلسەفە ئاراستەکەیان جیاوازە. واتە ماتماتیک لە سادەوە بەرەو ئاڵۆزەو، فەلسەفەش لە ئاڵۆزەوە بەرەو سادە.

2) دیکارت بەم شێوەیە میتۆدگەلی ماتماتیک و فەلسەفە پێکەوە گرێ دەدات: مرۆ لە A وە دەست

پێدەکا کە پرسێکی ئاوێتە و ناریزبەندە. لێرەدا فەیلەسووف هەوڵ دەدا لە ڕێگای ئانالیزەوە بگاتە B کە دیاردە و ڕاستیەکی ڕوون و سادەیە. واتە لێرەدا فەیلەسووف دیاردە ئاڵۆزەکەی بەسەر هەندێ بەشی سادە و ڕووندا دابەش کردووە. دواتر لە ڕێگای سێنتێزەوە ئەم بەشە ورد و ڕوونانە پێکەوە گرێ دەدا و دەگا بە C کە ئاوێتەیەکە لێیان، بەڵام ئێستا ئیتر ئەم ئاوێتەیە ڕاستیەکی ئاڵۆز نییە و مرۆ دەتوانێ ریزبەندی بکا و توانای بەسەریدا بشکێ. ئەم میتۆدە لە چوار یاسا پێک هاتووە: ا) کاتێک ڕووبەڕووی دیاردەیەک دەبیتەوە، لەو بەشەیەوە دەست پێبکە کە ڕوون و سادەیە، ئاڵۆز نییە و بەهیچ جۆرێک ناکرێ گومانی لەسەر بکرێ (لێرەدا مەبەست قۆناغی B یە کە پێشتر ئاماژەی پێکرا. ب) تا دەتوانی پرسەکە بەسەر بەشی وردتردا دابەش بکە، هەتا ئەو جێگایەی دەست دەدا (ئانالیزەکردن لە A وە بۆ B). پ) دواتر لە سادەوە بەرەو ئاوێتە دەست بدەوە بە سازدانیان (سێنتێزە لە B وە بۆ C). ت) بەراوردێکی کامڵ ئەنجام بدە (ئەمە هەڵبەت هەموو ڕەوتەکە دەگرێتەوە).

3) ئەم میتۆدە لە دوو بواردا کەڵکی لێ وەردەگیرێ: ا) لە بواری کێشەی هەستدا، واتە ئەو نادڵنیاییەی سەبارەت بە هەست هەمانە وەک سەرچاوەی ناسین، بەو مانایە کە داخۆ مرۆ دەتوانێ پێ لەسەر

هەندێک لایەنی هەست دابگرێ و دڵنیا بێت لەوەی سەرچاوەی باوەڕپێکراوی ناسینە. ب) لە بواری ئانالیزەدا، ئانالیزە بەگوێرەی "گومانی میتۆدیک" دەچێتە پێش کە بەرەبەرە هەموو ئەو ناسینانە فڕێ دەدا کە جێگای گومانن. هەڵبەت گومان بەو مانایە نییە کە ئیدی هیچ شتێک جێگای متمانە و باوەر نییە. گومان فۆڕمێکی بیرکردنەوەیە و بیرکردنەوە پێویستی بە بوونێکی بیرمەند هەیە. جا ئەمە دەتوانێ بە رستەی "کۆگیتۆ" مان Cogito بگەیەنێ کە دەڵێ: "من بیر دەکەمەوە کەواتە هەم!". راستیەکەی ئەوەیە کە من وەک بوونێکی بیرمەند هەم، واتە لێرەدا بە قۆناغی B گەیشتووین، ئەو قۆناغەی سادەیە و دەربڕی حەقیقەتی روونە.

4) دیکارت پێی وا نییە کە تەنیا کۆگیتۆ راستیەکی روون و ئاشکرایە. بەڵکو شتی دیکەش هەن. بۆ وێنە: ا) وێنای هۆکار: ئەم وێنایە ئەوەمان پێ دەڵێ کە بە بێ هۆکار هیچ کارتێکردنێک ناتوانێ لەئارادا بێت. کارتێکەری سەرچاوەکانی خۆی لە هۆکاردا دەبینێتەوە. ب) وێنای خودا: سەرەڕای ئەوەی مرۆ دەتوانێ بوونی خودا رەت بکاتەوە، بەڵام ناتوانێ نکوڵی لەوە بکا کە وێنای بوونێکی کامڵ و بێ عەیب لە بیر و زەینی مرۆدا هەیە. وێنای خودا دەبێ ریشەی لە هۆکارێکدا هەبێ، جا ئەم هۆکارەش ناتوانێ من بێت ئەگەر من بوونێکی کامڵ بم (واتە بوونی کامڵ

ناتوانێ بیر لە بوونی کامڵ بکاتەوە. وەرگێڕ). هۆکار دەتوانێ خودا خۆی بێت وەک بوونێکی کامڵ، بۆیە دیکارت لە B وە بەرەو C دەچێ واتە ئەو قۆناغەی ئاوێتەی منی بیرمەند و خودا ئیدی راستیەکی حاشا هەڵنەگرە.

5) گەر خودا بوونێکی کامڵە، ئیدی تەنیا دەتوانێ بەخشینەری وێنا روون و ئاشکراکان بێت، بەڵام هەر لەو کاتەدا وێنایەکی روون و سادە و ئاشکرای دیکەش لە زەینی مرۆڤدایە ئەویش ئەوەیە کە مەتریاڵ بوونی هەیە، واتە ئەو شتانەی بە دەوری منەوەن و خاوەن بارستایی، پانتایی و درێژین. هەروەها منیش بۆ خۆم خاوەن مەتریاڵێکی لەم چەشنەم. کەواتە گومان لەوەدا نییە کە لە پاڵ بوونی بیرمەند، جەستە، واتە شتیش هەیە.

6) مرۆ یەکەیەکە پێکهاتوو لە جەستەو بیر (رۆح). ئەمە وێنایەکە لای مرۆ، بەڵام چونکە مرۆ لەوە دڵنیایە کە وەک بوونێکی بیرمەند جودا لە جەستە بوونی هەیە، دیکارت بەو ئاکامە دەگا کە مرۆ وەک رۆح بەتەواوی جودا لە جەستە بوونی هەیە.

7) رۆح هەڵگری ئەو وێنایانەیە کە لە رێگای جەستەوە (هەستەکان) پێی دەگا، بەڵام وێنا هەستیەکان لە چاو وێنا عەقڵیەکان کە راستەوخۆ لە رێگای عەقڵەوە پێی

دەگا، ناڕوونن. کەواتە وێنا هەستیەکان ناتوانن وەک وێنا عەقڵییەکان بەخشێنەری ناسینێکی روون و جێگای رەزامەندی بن.

## رەخنەی هیوم لە ئایدیا و لە پرسی هۆکار. چۆنیەتی روانینی وی بۆ پەیوەندیی نێوان هەست و بیر

1) بە بۆچوونی هیوم زەینی مرۆڤ سەرەتا وەک تەختەرەش تەختەرەشێکە هیچی لەسەر نەنووسرابێت. هەموو ئەو ئایدیا و بیرانەی دواتر ئەم تەختەرەشە داگیر دەکەن لە هەستەکانەوە سەرچاوە دەگرن. بەواتایەکی دی هەست سەرچاوەی مەتریالی بیر و ئەندێشەکانی مرۆڤە.

2) وێنا و بیری مرۆ کۆپیی کارتێکەرییەکانی جیهانی دەرەوەیە لەسەر هەست. هەربۆیە ئایدیاکان ناتوانن بەقەدەر خودی ئەم سریمە و کارتێکەریانە زیندوو و بەهێز بن. کارتێکەرییەکان، ئەزموونن (بۆ وێنە وەک ژان و ئازار) وێناکانیش یان لە فۆڕمی یادەوەریدا خۆیان دەنوێنن یان لە فۆڕمی فانتازیدا (بۆ وێنە وەک ئەزموونی ژان). لە پاڵ سریمەی رووتی هەستدا (ئەوەی کە شتێک کار دەکاتە سەر هەست) سریمەی کاردانەوەی مرۆ هەیە (بۆ وێنە وەک خۆشحاڵی و

ئومێد) هەروەها ئەو وێنایانەی لە سریمەکانی سەر هەست دەچن.

3) بەبێ سریمەی سەر هەست ئایدیا، بیر یا خود وێناش ناتوانن لە مرۆڤدا پێک بێن. هەر لەو کاتەدا مرۆ دەتوانێ وێنا سادەکان (کە بەهۆی سریمەوە پێک هاتوون) بخاتە پاڵ یەک و وێنایەکی ئاوێتەیان لێ ساز بکات. بەجۆرێک کە ئیدی هاوتەراز نین لەگەڵ سریمەکان (بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بە دەستەواژەی "کێوی ئاڵتون" بکەین کە "کێو" و "ئاڵتون" سریمەی جیهانی دەرەوەن لەسەر ئێمە، بەڵام "کێوی ئاڵتون" کە بەرهەمی لێکدانی "کێو" و "ئاڵتون" ە، داهێنراوی مرۆڤە و لەراستیدا دەربڕی سریمەی راستەوخۆی جیهانی دەرەوە لەسەر ئێمە نییە).

4) توانای مرۆ لە بابەت لێکدانی وێناکان و ئەوەی ئەم وێنا ئاوێتانە راستەقینە نین، هیوم بەرەو ئەوە پاڵ پێوە دەنێ کە کۆمەڵێک رەخنە ئاراستەی ئەم دیاردەیە بکا. بەرای وی زۆربەی ئایدیا، بیر و وێنا ناڕوونەکان وێناگەلی لێک گرێدراون (واتە مرۆ بۆ خۆی سازیان دەکا۔ وەرگێڕ). کەواتە بۆ بەدیارخستنیان دەتوانین لە رەوشی ئانالیزە کەڵک وەربگرین و ئەم ئایدیا لێک گرێدراوانە بەسەر بەشە سادەکاندا دابەش بکەین. ئەوسا سەبارەت بە هەر بەشێک ئەم پرسیارە ئاراستە بکەین: "ئەم وێنایە لە

چ سریمەیەکەوە سەرچاوەی گرتووە؟". ئەم شێوەیە لەسەر ئەوە بڕیار نادا کە کام وێنا ڕاستە، بەڵکو ناوەڕۆکی ڕوونی وێناکەمان پیشان دەدا.

5) گرنگترین وێنا کە هیوم لێی دەکۆڵێتەوە "وێنای هۆکارە". ئەوەی کە A و B لە پەیوەندێکی هۆکارگرانەدان بەجۆرێک کە Aکاتێک وەبەر B دەکەوێ دەبێتە هۆی جوڵەی B. هیوم بەم شێوەیە وێنای هۆکار شی دەکاتەوە: ا) A و B لە شوێن و کاتدا وەبەر یەک دەکەون. ب) A پێش B دەکەوێ. پ) پەیوەندیی پێویست لەنێوان A و B دا هەیە، بەجۆرێک کاتێک A هەیە، بە ناچار و بەگوێرەی پێویست B ش هەیە، یاخود دێتە ڕوودان.

6) لە ئانالیزەدا هەر بەشێک دەگەڕێندرێتەوە بۆ سەرچاوە هەستیەکەی، واتە ئەو سریمەیەی لەسەر هەست بوویەتی. گەر سەیری قۆناغەکانی ئەلف و بێ لە بەشی پێنجدا بکەین، دەبینین کە ئەمە دەتوانێ کردەیەکی سەرکەوتوو بێت. بەڵام سەبارەت بە بەشی پ وەها نییە، چونکە پەیوەندیی نێوان A و B پەیوەندێک نییە کە سەرچاوەی لە هەستدا بێت. ئێمە A و Bهەست پێدەکەین، بەڵام پەیوەندیی نێوان ئەم دووانە هەست پێ ناکەین.
7) هیوم لێرەدا ئەم دیاردەیە بە دەستەواژەی "سریمە ـ کاردانەوە" شی دەکاتەوە. مرۆ گەلێک جار دەبینێ

که A و B وەبەر یەک دەکەون و دوای ئەوەی که A دەجولێ و وەبەر B دەکەوێ، B ش دەکەوێتە جولە. دووپاتبوونەوەی ئەم حالەتە چاوەڕوانیەک لە ئێمەدا دروست دەکا (ئەوەی که A دواتر B دەخاتە جولە). جا ئەم چاوەڕوانیە بنەمای وێنای پەیوەندیی پێویستیی نێوان A و B یە. ئەم چاوەڕوانیە مەیلێکی زاتیە لە مرۆدا بۆ چێکرنی عادەت.

8) وێنای "زەروورەت و پێویستی" ئیلەمێنتی بنەڕەتی لە وێنای هۆکاردایە. مرۆ ئەمە چێ دەکا و بە سروشتی زیاد دەکا. بە واتایەکی دی ناتوانین بڵێین کە پەیوەندییە زەروورییەکان لەناو سروشتدا هەن. "وێنای هۆکار" تەنیا لە زەینی مرۆدایە و خاوەن مانایەکی پراکتیکی گرنگە لە ژیانی رۆژانەدا.

52






## بەکورتی:

هەر چەشنە بیر و وێنایەک رەگی لە سریمەدا هەیە، جا ئەو سریمەیە لە رێگای هەستەکانەوە بێت یان لە رێگای کاردانەوەوە. ئەو وێنایانەی کە رەگیان لە سریمەدا نییە، ناروونن و هەر بۆیە شیاوی فرێدانن. "وێنای هۆکار" ئەگەرچی رەگی لە چاوەڕوانی مرۆدا هەیە و سریمەیەکی دەروونیە، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە بێکەڵکە و جێی بڕوا نییە. "وێنا هۆکار" رەگی لە سروشتی مرۆدا هەیە.

## چۆنیەتی لێکدانەوەی مۆڕال لای هیوم

1) هیوم دوو پرسی سەرەکی لە فەلسەفەی مۆڕاڵدا لێک جیا دەکاتەوە: ئەلف) موتیف یاخود هاندەری ئاکار ب) سەرچاوەی لێکدانەوەی ئاکار. مەبەستی هیوم لە بەشی ب دیاریکردنی پێودانگی هەڵسەنگاندنی کردەی ئەخلاقە. لێرەدا مەبەست دەرخستنی بنەڕەتی لێکدانەوەی کردە ئەخلاقیەکانە.

2) لە وەڵامدانەوەی پرسیاری یەکەمدا هیوم دەڵێ کە بیر (عەقڵ) سەرچاوەی ئاکار نییە. هەروەها بیر ناتوانێ لە ئەنجامدانی کردەیەک مرۆ پەشیمان بکاتەوە. لەراستیدا هەست، خواست و جوڵە رۆحیەکانی وەک ترس و برسیەتی و حەز و... سەرچاوەی ئاکارن. هەروەها هەڵخرێنەرێکی هەستی تەنیا دەتوانێ بەهۆی هەڵخرێنەرێکی هەستیی دیکەوە بەتاڵ بکرێتەوە (بۆ وێنە ترس لە سزا وەرگرتن).

3) هەڵبەت بیر دەتوانی دەوری لە ئاکاردا هەبێ، بەڵام نەک لە دیاریکردنی ئامانجی ئاکاردا، بەڵکو لە دۆزینەوەی رێگا بۆ گەیشتن بە ئامانج (بۆ وێنە من سەرمامە و دەبێ خۆم گەرم بکەمەوە. لێرەدا بیر یارمەتی دەدا بەوەی چلۆن من دەتوانم خۆم گەرم بکەمەوە). بیر تەنیا کۆیلەی هەستەکانە و بۆیە دەبێ

خزمەتکار و گوێرایەڵیان بێت.

4) لە وەڵامی پرسیاری دووهەمدا هیوم پێی وایە کە لەم بەشەدا عەقڵ رۆڵێکی لە جاران زۆرتر دەگێڕێ و بە رواڵەت وا دەردەکەوێ کە لەگەڵ هەستەکان کارتێکەری هەیە، بەڵام هەر لەو کاتەدا حوکمە مۆراڵیەکانی ئێمە پەیوەستن بە هەستێکی دەروونیەوە. بیر تەنیا دەتوانێ ئێمە لە بابەت ئەو حەقیقەتەوە کە پەیوەستە بە ئاکارێکەوە، وشیار بکاتەوە (بۆ وێنە حەقیقەتی کوشتن). دیاریکەری حوکمە ئەخلاقیەکان لە کاردانەوەی هەستیانەی مرۆدان، نەک لە واقعە رووتەکاندا. بێزاری مرۆ لە قەتڵ لە دەروونی مرۆدایە نەک لە واقعی کوشتنەکەدا. ئەم کاردانەوەیە لە هەستەوەیە نەک لە بیرەوە. بنەڕەت و ئەساسی هەستی ئەخلاقیانەی مرۆ لە مەیلێکی سروشتیدایە کە لە مرۆڤدا هەیە، واتە لە کاردانەوەی لەبەرامبەر سریمەدا.

54

5) بێزاری یاخود حەزی مرۆ بەرامبەر بە ئاکارێک، هەستێکی لە خۆڕا و کتوپڕی نییە، بەڵکو رەگی لە حەز و خۆشیدا هەیە. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤەکان تێگەیشتنێکی هاوبەشیان لە ئاکار هەبێ. هەستێکی دەروونی لە مرۆڤەکاندا هەیە کە لەنێوانیاندا هاوبەشە و ئەمە پێوەرێکی نەگۆڕ و گشتی بۆ هەڵسەنگاندنی کردە و ئاکارە ئەخلاقییەکان بە مرۆ دەبەخشێ.

6) ئەم هەستە ئەخلاقیە هاوبەشە، کاتێک لاواز دەبێ کە حەزە تاکە کەسیەکان بەتەواوی بەسەر هەستەکاندا زاڵ بن. بۆئەوەی مرۆ شیاوی دانی حوکمی ئەخلاقی بێت، دەبێ لەم حاڵەتە دوورکەوێتەوە (دادوەری بێ لایەن).

## بەکورتی:

سەبارەت بەم دوو پرسیارە کە ا) هۆکاری ئاکار چیە و ب) بنەڕەتی هەڵسەنگاندنە ئەخلاقیەکان کامانەن، هیوم وەڵام دەداتــەوە کە هۆکار و بنەرەتەکان لە هەستدان نەک لەو زانیاریەکانمان سەبارەت بە کردە ئەخلاقیەکان. دادوەرێکی ئەخلاقیی باش بێ لایەنە، واتە کاتێک حوکمی ئەخلاقی دەدا، بەگوێرەی ئەو هەستە ئەخلاقیانە دەری دەکا کە لەنێوان مرۆڤەکاندا هاوبەشە.

**هەبەستی کانت لە ئاپریۆری** a priori، **روانگەی وی سەبارەت بە فۆڕمە ئاپریۆریەکان و رۆڵی ئەم فۆڕمانە لە زانیاریدا. کانت لەنێوان ئەزموونگەراکان و عەقڵگەراکاندا.**

1) کانت لەگەل ئەزموونگەراکان هاوڕایە کە ناسینی مرۆڤ لە بابەت دنیای دەرهەست، لە هەستەکانەوە دەست پێدەکا، بەڵام هەر لەو کاتەدا شتێک بەم بۆچوونەش زیاد دەکا کە ئێمە وەبیری عەقڵگەراکان دەخاتەوە. ئەویش ئەوەیە کە ناسینی مە لە بابەت دنیای دەرهەست لە گشتیەتی خۆیدا تەنیا لە ئەزموونەوە بەدەست نایەت. مرۆ لە ڕێگای هەستەکانەوە دنیای مەتریال ئەزموون دەکا، بەڵام هەر لەو کاتەدا بەهۆی ئەو پێکهاتە هوشیاریەی لە مرۆدا هەیە، ئەو ئەزموونانە لە فۆرمگەلی دیاریکراودا دەرک پێدەکا. کەواتە ناسینی دنیای دەرهەست پێکهاتەیەکە کە لە دوو بەش یاخود فاکتۆر پێک هاتووە: یەکەم ئەو شتانەی مرۆ لە ریگای هەستەکانەوە وەریاندەگریَ، واتە ئەو شتانەی لە ریی ئەزموونەوە (ئاپۆستریۆری) پێیان دەگا. دووهەم ئەو توانا ناسینیەی لە مرۆدا

هەیە و بەهۆیەوە مرۆ دەتوانێ بەشداری لە پرۆسەی ناسیندا بکا. کە ئەمەش وەک وترا ئەزموونی نییە، بەڵکو توانایەکە کە لەمرۆدا هەیە و پێش ئەزموون دەکەوێ (ئاپریۆری). ئاپریۆری، بە دنیای دەرهەست کۆمەڵێک تایبەتمەنی دەبەخشێ کە بنەڕەتین.

2) ئەو کارەی بەشی وشیاریی مرۆ لەگەڵ ئەزموونە هەستیەکان دەیکا، لە چەند قۆناغی یەک بەدوای یەکدا خۆیان نیشان دەدەن، کە بەم شێوەن: ا) جیهان کە سەربەخۆیە لەمرۆ (وەک بوونێک لە خۆیدا) لەسەر هەستەکان کارتێکەری هەیە، بەشێوەیەک کە ئەم کارتێکەریانە سەرەتا کۆمەڵێک ئەزموونی هەستین کە ناڕێک و پێکن و هێشتا مرۆ نەیتوانیوە کاریان لەسەر بکا. ب) کارتێکەرییە هەستیەکان بەهۆی ئەو فۆڕمانەی لە وشیاریی مرۆڤدا هەن (وەک کات و شوێن) ریک و پێک دەکرێن و لە کات و شوێندا بەهۆی وشیاریی مرۆڤەوە رێک دەخرێن. کات و شوێن دوو دیاردەی ئاپریورین کە لە وشیاریی مرۆڤدا هەن و جۆری هەستپێکردنی جیهانی دەرهەست دیاری دەکەن. هەروەها وشیاری دەبێتە هۆی ئەوە کە ئەزموونە هەستیەکان بەشێوەی دیاریکراو پێکەوە گرێ بدرێن بۆئەوەی مرۆ بتوانێ دەرکیان بکا. ت) ئەم فۆڕمانە لە توانای بیرکردنەوەی مرۆڤدان و ئاپریورین (واتە لە ئەزموونەوە نایەن و پێش ئەزموون دەکەون). گرنگترین داوا لێرەدا ئەوەیە کە ئەزموونە هەستیەکان دەبێ لە پەیوەندییەکی

هۆکارانەدا لەگەڵ یەکتر بن (kausalitet).

3) کەواتە دەبێ چەند شت لە یەک جودا بکەینەوە: لەلایەک ئەزموونە هەستیەکان و لەلایەکی دیکەوە ئەو شێوە ئاپریۆریانەی لە شێوەی روانین و تێگەیشتنی ئێمەدا هەن (واتە کات و شوێن کە فۆڕمن و تێیاندا روانین و تێگەیشتن و هۆکار بەرجەستە دەکرێن). شێوە ئاپریۆریەکان لەمرۆدا هەن و پێش ئەزموون دەکەون و مرۆ توانای سڕینەوەیانی نییە. توانای ئاپریۆریانە لە روانیندا، ئەو دەرفەتە بە مرۆ دەدەن کە ئەزموونە هەستیەکان بخاتە نێو چوارچێوەی کات و شوێنەوە و لە تێگەیشتنیشدا ئەو دەرفەتە دەدەن کە مرۆ دیاردە هەستیەکانی جێگرتوو لە کات و شوێندا پێکەوە گرێ بدا (بۆ وێنە بیانخاتە ناو پەیوەندییەکی هۆ و هۆوەرگردا).

4) کەواتە ئەو تایبەتمەندییە گرنگانەی لە کاتی دەرکی جیهانی دەرهەست لە پرۆسەی ناسیندا خۆیان نیشان دەدەن، نە بەرهەمی جیهانی دەرەوە، بەڵکو بەرهەمی فۆڕمەکانی روانین (کات و شوێن) و فۆڕمەکانی تێگەیشتنن (هۆ و هۆدار) کە لە خودی مرۆڤدا هەن (ئاپریۆرین). کانت لێرەدا دەتوانێ بڵێ کە ئیدی جیهان بەگوێرەی فۆڕمەکانی ناو وشیاری مرۆڤ رێک و پێکی وەردەگرن. هەربۆیە مرۆ بدەری یاسا سروشتیەکانە. بیری مرۆ سەرچاوەی زۆربەی ئەو خەسڵەتە بنەڕەتیانەن کە وەپاڵ سروشت دەدرێن

(شۆرشی کۆپێرنیکوسیانەی کانت: بەگوێرەی ئەم تێگەیشتنەی کانت، مەتریال لە ڕێگای ناسینەوە فۆڕمی ڕێک و پێک وەردەگرێ، نەک ئەوەی کە ناسین لە ڕێگای مەتریاڵەوە فۆڕمی ڕێک و پێک وەربگرێ). جیهان ئیتر لەم کاتەدا لە خۆیدا نییە و بەڵکو وەک دیاردەیەکە کە خۆی نیشانی ئێمە دەدا (فێنومێن). جیهان لێرەدا بەگوێرەی فۆڕمەکانی ناو وشیاری مرۆڤ ڕێک دەخرێ.

5) بنەمای شۆرشی کۆپێرنیکۆسیانەی کانت لە هەندێک فۆڕمی ئاپریۆریانە و سینتەزیانەدا خۆی دەبینێتەوە. بەو مانایە کە ئەم فۆڕمانە پێویستن و بەگشتی دەربارەی جیهانی دەرهەستن و هەندێک زانیاری ڕاستەقینەمان لە بابەت دنیای دەرهەستەوە پێشکەش دەکەن.

ئەم فۆڕمانە زانیاری مرۆ سەبارەت بە دنیای دەرهەست بەربلاوتر دەکەن، بەڵام پێویستیان بەوە نییە کە لە ڕێگای ئەزموونەوە تەئید بکرێن. هۆکارەکەیشی ئەوەیە کە ڕاستیی وان لە ئەزموونەوە سەرچاوە ناگرێ، بەڵکو لە وشیاریی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرن. ئەم فۆڕمانە پەیوەندییان بە شێوەی جیهانی دەرهەستەوە هەیە. زۆربەی فۆڕمەکانی وەک شوێن، کات و هۆ و هۆوەرگر فۆڕمی ناسینن و سینتەزی و ئاپریۆرین. پێش ئەوەی مرۆ جیهانی دەرهەست ئەزموون بکا، لە ڕێگای ئەم فۆڕمانەوە دیاری دەکا

کە جیهانی دەرهەست دەبێ خاوەنی چ تایبەتمەندیی گەلێک بێت.

6) لێرەدا چەند نموونەیەک لە فۆڕمی روانین و فۆڕمی تێگەیشتن دەهێنینەوە: "تەنیا یەک شوێن هەیە"، "رابردوو ناگەڕێتەوە"، هەر رووداوێک هۆکارێکی هەیە". دوو نموونەی یەکەم پیشاندەری فۆڕمەکانی روانینن (واتە فۆڕمەکانی کات و شوێن). رستەی سێهەمیش نموونەی فۆڕمی تێگەیشتنە (واتە هۆ و هۆوەرگر). فۆڕمەکانی روانین پێکهێنەری بنەمای ماتماتیکن، فۆڕمی تێگەیشتنیش پێکهێنەری زانستی سروشتناسی. بە بۆچوونی کانت رستە ماتماتیکی و فیزیکیەکان سێنتەزی و ئاپریۆرانەن.

7) بە بڕوای کانت مرۆ ناتوانێ جیهان وەک بوونێکی سەربەخۆ لە خۆی، وەک بوونێک لە خۆیدا بناسێ. مرۆڤ تەنیا دەتوانێ تەنیا کاتێک سەبارەت بە جیهان ببێ بە خاوەنی زانیاری و زانست کە جیهان وەک دیاردەیەک لەسەر هەستەکانی ئێمە کارتێکەری هەبێ و بەم شێوەیە لە رێگای هەستەکانمانەوە جیهان وەک دیاردەیەک بناسین. واتە مرۆ ناتوانێ جیهان وەک خۆی بناسێ، بەڵکو تەنیا دەتوانێ تا ئەو جێگایە بیناسێ کە وەک دیاردەیەک خۆی نیشانی مرۆ دەدا. هەروەها ناتوانین بڵێین کە شتەکان وەک "شت لە خۆیاندا" لە دەرەوەی ئێمە بوونیان هەیە، چونکە شوێن فۆڕمێکی دیتنە لە مرۆڤدا. "شت لە

خۆیدا" بەدوورە لە سنووری ناسینی مرۆ.

لە کۆتاییدا بەگشتی دەتوانین بڵێین کە کانت لەنێوان ئەزموونگەراکان و عەقڵگەراکاندا راوەستاوە.

## ڕوانگەی کانت سەبارەت بە موڕال. پەیوەندیی نێوان یاسای موڕاڵ (ئەمری ئیجبار) 1و بایەخ و ئازادی مرۆڤ

1. لە کاتی ناسینی ڕاستیەکاندا عەقڵی مرۆ وەک یاسادانەرێک خۆی دەردەخا. جا هەر بەهەمان شێوە عەقڵی پراکتیکیانەی مرۆ لە بواری موڕاڵیشدا خۆی دەردەخا. واتە وەک یاسادانەرێکی بواری ئاکار و کردە. کاتیگۆریەکانی عەقڵی تیۆریستانەی مرۆ ئاپریۆرین (پێش ئەزموون دەکەون) و فۆڕمەکانی ئەزموون دیاری دەکەن. هەر بەهەمان شێوە یاسا موڕاڵیەکانیش ئاپریۆرین فۆڕمی ئاکار لە ڕێگای "ئەمری ئیجبار"ەوە دیاری دەکەن. مرۆ بوونەوەرێکی سەربەستە لەوەی گوێڕایەڵی یاسایەکی موڕاڵی بێت یان نەبێت. ئاپریۆری بوونی یاسا موڕاڵیەکانیش خۆ بە خۆ بە مانای ڕەچاوکردنیان لەلایەن مرۆڤەکانەوە نییە. هەر بۆیە یاسا موڕاڵیەکان خۆیان بەشێوەی ئەمر نیشان دەدەن و وەک ئەرکێک خۆیان دەنوێنن.

2. لێرەدا دوو پرسیار دێتە گۆڕێ: ا) چلۆن عەقڵی پراکتیکی لە ڕێگای یاسای موڕاڵییەوە کردار و ئاکار دیاری دەکا؟ ب) یاسای موڕاڵی چ دەڵێ؟ چۆن مرۆ دەتوانێ لەوە دڵنیا بێت کە ئەوەی ئاراستەی کراوە،

خاوەن یاسای مورِاڵیە؟

3. سەرەتا کانت بەبێ خۆ نزیککردنەوە لە یاسای مورِاڵ برِیارێکی لەم چەشنە دەردەکا: ا) جوڵێنەرەکانی کردە لە دوو شت دان، لە جیهانی دەرەوەو لە پێویستییە دەروونیەکاندا (وەک حەز و خولیاکان). ب) مەیل دوای هەڵسەنگاندن هەڵدەبژێرێ. کە ئەمە دەبێتە هۆی. پ) ئەوەی مرۆ کردەیەک رەچاو کا و بەم کردەیە بەرەو گەیشتن بە مەبەست هەنگاو هەڵبگرێت. جا یاسای مورِاڵ دەتوانێ راستەوخۆ ئەم پرۆسەیە بخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە. واتە بەشێوەیەک کە "مەیل" ئیدی تەنیا لەژێر کاریگەریی یاسای مورِاڵیدا بێت نەک لەژێر بزوێنەرە ئەزموونیەکاندا.

4. لە ترمینۆلۆژی کانتدا تەنیا زەمانێک کردە دەتوانێ پرِاوپرِ ئەخلاقی بێت کە مەیل لەژێر کاریگەری یاسای مورِاڵیدا برِیاری دابێت. بۆ نموونە گەر من مەبەستم لە یارمەتیدانی خەڵک ئەوە بێت کە ئەوان شادمان بکەم ئەوا کردەکەم ئەخلاقیە، بەڵام ئەگەر لەپێناوی حەز و مەیلەکانی خۆمدا ئەو کارەم کردبێت ئەوا کردەکەم شایانی مەدح نییە. یاسای مورِاڵ، دەبێ تەنیا بزوێنەر و موتیڤی ئەخلاق بێت. تەنیا، ئەو کردە ئەخلاقیە، کە بەهۆی ئەرکەوە بەرِێوە بچێت. هەربۆیە یاسای ئەخلاقی مەجبوورکەرانەیە و بەم شێوەیە فۆرموڵ بەندی دەکرێت: "تۆ دەبێ...".

5. بەڵام ئیجباربوونی یاسای موراڵ بە مانای ئەوە نییە کە مرۆ هەست بە یەخسیری و نائازادبوونی خۆی بکات. چونکە یاسای موراڵ لە دەروونی مرۆڤدایە و بەشێکە لە عەقڵی مرۆڤ، نەک دیاردەیەک لە دەرەوەی مرۆڤ. تێگەیشتن لەوەی یاسای مۆراڵ لە مرۆڤدایە دەبێتە هۆی سەرسوڕمان و ڕێزی مرۆ لە یاسای موراڵ. ڕێزی مرۆ بۆ یاسای موراڵ دەبێتە هۆی ئەوەی ئیدی مرۆ ڕەچاوی بکا. ئەرک بریتیە لە: "پێویستیی کردە بەهۆی ڕێز بۆ یاسا".

6. یاسای موراڵ لە بابەت چ شتێکەوەیە؟ لەگەڵ ئەوەی یاسای موراڵ فۆرمی کردە دیاری دەکا، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە بۆ هەر کردەیەکی ڕۆژانە پێشنیاری تایبەتی هەبێ. یاسای ئەخلاقی تەنیا دەتوانێ کۆمەڵێک فورموڵی گشتی دەستنیشان بکا. ئەو ڕستانەی یاسای مۆراڵیان تێدا فۆرموڵە دەکرێ بە "تۆ دەبێ..." دەست پێدەکەن و وەک وترا پێیان دەگوترێ "ئەمری ئیجبار". بۆ وێنە یەک لەوان دەڵێ: "تۆ دەبێ کردەت وەها بێت کە یاسای بڕبڕەی کردەکەت بتوانێ ببێ بە یاسایەکی گشتی". دۆزینەوەی یاسای موراڵ زۆر دژوار نییە، بەس مرۆ تەنیا دەتوانێ لە کاتی ڕەچاوکردنی کردەیەکدا لە خۆی بپرسێ کە داخۆ یاسای بڕبڕەی ئەم کردەیە دەتوانێ ببێ بە یاسایەکی گشتیی وەها کە هەموان

بتوانن قبووڵی بکەن و رەچاوی بکەن!

7. ئەمرە ئیجباریەکانی دیکەی کانت باس لەوە دەکەن کە هەموو مرۆڤەکان لە خۆیاندا خاوەن یاسای مۆراڵن و ئەمە بایەخێکی وەها بە مرۆ دەدا کە بتوانێ ببێ بە پاشای بوونەوەرەکان. ئەم بایەخە دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ تەنیا وەک ئامراز سەیر نەکرێت، بەڵکو وەک ئامانجیش. مرۆ تەنیا بوونەوەرێکی ئازادی سەر رووی زەوییە، چونکە تەنیا مرۆڤە کە دەتوانێ بەکەڵک وەرگرتن لە یاسا مۆراڵیەکان، یاسا بۆ خۆی دیاری بکا (ئەوتۆنۆمە). لەو کاتەدا هەر مرۆڤێک یاسا بۆ خۆی دیاری دەکا، راستەوخۆ ئەم یاسانە بۆ مرۆڤەکانی دیش دەشێن. هەر مرۆڤێک دانەری یاسای گشتیە. واتە مرۆڤەکان هەموویان لەم بارەیەوە یەکسانن و کەس لە کەسی دی بانتر یاخود خوارتر نییە.

## تایبەتمەندییەکانی روانگەی مێژوویی هیگل

1) هیگل لە دوو بواری بەرواڵەت لێک جیاوازدا کەڵک لە واژەی دیالکتیک وەردەگرێ: یەکەم) لە بواری

بەکورتی:
یاسای مـورِال (عەقڵی بەکردە) ئاپریوریە و کردە دەخاتە چوارچێوەی داوای دیاریکراوەوە. بۆ وێنە دەڵێ کە ئەو یاسایەی دەبێتە بناغەی کردەی مرۆڤ، دەبێ بتوانێ یاسایەک بێت کە هەمووان بگرێتەوە. یاسای مـورِاڵ دەبێتە هـۆی ئـەوەی مـرۆ شوێنی تایبەت و جیای لە بوونەوەرەکانی دیکە هەبێ و لە باری بایەخەوە بەرزتر لە بوونەوەرەکانی دیکە لە چەرخی گەردووندا رابوەستێ.

1- det kategoriske imperativ

دارشتنی مودێلێک بۆ رەوتە مێژووییە گرنگەکان (ئەو رەوتانەی مەودایەکی زەمەنی درێژخایەن لە مێژوو داگیر دەکەن). دووهەم) لە بواری داڕشتنی مودێلێک بۆ ئەو بیرو ئایدیانەی لە رەوتی مێژوودا خۆیان بەدیار دەخەن.

2) بەم مودێلانە یاخود مودێلە دەگوترێ دیالکتیکی (لە دیالۆگەوە دێت)، چونکە جارێکی دی لە ئاڵوگۆڕی ئەندێشە و مانادا خۆی دەبینێتەوە و لە سێ قۆناغ پێک دیت: 1) تێز Tese. 2) ئانتی تێز Anti Tese. 3) سینتێز Syntese. تێز لەگەڵ ئانتی تێز رووبەڕوو دەبێتەوە کە ئەنجامی ئەم وێککەوتن و رووبەرووبوونەوەیە سینتێزە. بۆ وێنە کەسێک بۆچوونێک دێنێتە گۆڕێ (تێز)، یەکی دی هەروا بەئاسانی قەبوڵی ناکا و هەوڵ دەدا بە هێنانی بەڵگە رووبەرووی بێتەوە (ئانتی تێز)، سەرئەنجام هەردوولا بە ئاکامێکی مامناوەندی دەگەن (سینتێز) کە بەرهەمی جەدەل و وتووێژی نێوانیانە. سینتێز، لێرەدا قۆناغێکی بەرزترە کە تێیدا دژبەرەکان یەکیان گرتووەتەوە.

3) لە رەوتی مێژوودا دیالکتیک بەم شێوەیە خۆی نیشان دەدا: بۆ وێنە سەرەتا وەک ا) بزووتنەوەیەکی گوتاری، کە دواتر ب) بەرەوڕووی بەرەنگاری (دژ) دەبێتەوەو سەرئەنجام پ) ئەو رفۆرمانەی کە لایەنە بەشدارەکانی بەسەریاندا دێت. لە بیرکردنەوەشدا

شێوەی بیرکردنەوە وەهایە کە مانا بە مانا دەچێتە پێش. لێرەدا نموونەیەکی بەناوبانگی خودی هیگل دێنینەوە کە تێیدا: ا) "بوونی بێ خەوش"1 هەڵگری ب) "هیچ"ە کە دژی خۆیەتی. پ) ئاکامی رووبەڕووبوونەوەو دژایەتی ئەم دووانە بریتیە لە پێکهاتنی جیهان، جیهانێک کە لەنێوان "هیچ" و بوونی بێ خەوشدا راوەستاوە. لەراستیدا ئەوە ئایدیا هیگلیەکانن کە بە ناو ئەم قۆناغانەدا گوزەر دەکەن و لە رەوتە مێژوویی و رەوتە فیکریەکاندا دەبنە هۆی گەشە و بەرەوپێشچوون.

4) مێژووی جیهان لە گەشەی خۆیدا ئەم سێ قۆناغە لە سێ دەورەدا نیشان دەدا: ا) جیهانی رۆژهەڵات. ب) جیهانی رۆمی - یۆنانی. پ) جیهانی ژێرمەنی. ئەو ئایدیایەی لەم رەوتەدا خۆی گەشە پێدەدا و خۆی واقعی دەکاتەوە، ئایدیای ئازادیە: ا) لە دنیای رۆژهەڵاتدا تەنیا یەک مرۆڤ ئازادە (دەسەڵاتداری سەرەڕۆ). ب) لە جیهانی رۆمی - یۆنانیدا کۆمەڵێک کەس ئازادن و پ) لە جیهانی ژێرمەنیدا هەموان ئازادن. ئەو هێزەی پاڵنەری بەرەوپێشبردن و گەشەی جیهانە، هیگل ناوی دەنێ "رۆحی جیهان".

5) کەس ناتوانێ بەر بە رۆحی جیهان بگری، بەڵام مرۆ دەتوانێ بەرەنگاریی خۆی بەرامبەر بە رۆحی جیهان تاقی بکاتەوە کە ئەمەش دەبێتە هۆی تێکشکاندنی لەژێر چەرخە بەهێزەکانی مێژوودا.

کەسانی دیکەش دەتوانن ئەم بەرەوپێشچوونە دەرک بکەن و ببن بەو ئامرازانەی لەرووی مەیل و حەزەوە خۆیان پێشکەش بە رۆحی جیهانی کردووە (وەک ئەلکساندرای مەزن، سیزار و ناپلیۆن). ئەمانە بۆ ماوەیەک دەتوانن ببن بە ڕێبەری رۆحی جیهانی و دواتر بۆ هەمیشە بزر ببن. مێژوو "یەکیەتیەکە لە ئازادی و زەروورەت": لە رایەڵەی گەورەی جیهاندا هەم تانی "گەشەی زەروورانەی مێژوو" هەیە و هەم پۆی "بەشداریکردنی ئازادانەی مرۆڤ".

6) وەک گوترا هەموو مرۆڤەکان لە دەوڵەتی ژێرمەنیدا بە ئازادی دەگەن، بەڵام ئازادی بەو مانایە نییە کە مرۆڤ چی پێ خۆش بوو بیکا. هیگل دەڵێ: "ئازادیی راستەقینە" بریتیە لە "زانین و ئەنجامدانی ئەو شتانەی یاسایین"، زانینی ئەوەی کە یاسای دەوڵەت چیە و چلۆن مرۆ دەتوانێ بە کردەوە رەچاوی بکا. تەنیا بەم شێوەیە هەموو مرۆڤەکان دەتوانن لە ئاستێکی دیاریکراودا ببنە خاوەنی ئازادی. ئازادی بۆ هەمووان ئاکامی هەبوونی ئەو یاسایانەیە کە دەبێ هەمووان لەناو کۆمەڵگادا رەچاوی بکەن.

**کیرکەگارد و "سێ شێوازی بوون". هەبەستی وی لە رستەی "سوبژە راستیە". فەیلەسووفە**

**بوونگەرا هۆدیرنەکان.**

1. کیرکەگارد رستەیەکی بەناوبانگی هەیە کە تێیدا دەڵێ "سوبژە راستیە". لە فەلسەفە و بۆچوونی ویدا لەنێوان سێ شێوازی بوون و ئەم رستەیەدا پەیوەندی هەیە. لە قۆناغی یەکەم یاخود خوارەوەدا ئەم رستەیە مانایەکی کەمی بۆ مرۆڤ هەیە، واتە لەم قۆناغەدا راستییە سۆبژیکتیڤیەکان لە ئاستێکی کەمدان، بەڵام لە قۆناغی سێهەم یاخود هەرە سەرەوەدا راستییە سۆنژیکتیڤیەکان ئاست و گرنگیان روو لە زیادبوون دەکا، کە بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بە بڕوای مەزهەبی بکەین. ئەم سێ قۆناغە بەم سێ تایبەتمەندییەوە پێناسە دەکرێن: قۆناغی یەکەم بە جیددیەتێک کە لە زیادبووندایە، قۆناغی دووهەم بە هاودڵی و قۆناغی سێهەم بە سۆز.

2. باسمان لە سێ شێوازی بوون کرد. کیرکەگارد شێواز یاخود قۆناغی یەکەم بە ستاتیکا پێناسە دەکا (هەڵبەت ستاتیکا لە مانا بنەڕەتیەکەی خۆیدا واتە لە مانا هەستیەکەیدا). ستاتیکەرەکان بە هەستەکانیان دەژین، بۆیە پەیوەندی یاخود تێگەیشتنێکی رواڵەتیان سەبارەت بە ژیان هەیە. ئەم پەیوەندییە نە جیددیەتی تێدایە و نە هاودڵی و نە سۆز. ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤەکان لەم قۆناغەدان و بەم شێوازە لەگەڵ ژیان لە پەیوەندیدان. ستاتیکەرەکان تێگەیشتنێکی کەمیان

لە بایەخەکان واتە شتە گرنگەکانی ژیان هەیە. ئەوان پێیان وایە کە مرۆ تەنیا جارێک دەژی و هەر بۆیە تەنیا دەبێ هەڵگری ئەوەندە بێ کە پێی پێشنیار دەکرێ.

3. گۆڕان لە هەر شێوازێکەوە بەرەو شێوازی دیکە بەشێوەی کتوپڕ یاخود "پەڕین" روودەدات. ئەم گۆڕانە زۆر جاران بەهۆی رووداوێکی چاوەڕواننەکراو یاخود هەڕەشەئامێزەوەیە کە ترس و نائومێدیمان تیا پێک دێنێ، بەڵام لەهەمان کاتدا چاومان دەکاتەوە لە ئاست ئەوەی لەراستیدا چ شتێک دەتوانێ مانا بە ژیان ببەخشێ.

4.ئەزموونێکی وەها دەتوانێ ئێمە بەرەو شێواز یاخود قۆناغی موڕاڵ (واتە شێوازی دووهەم - وەرگێڕ) ببات کە تێیدا مرۆ بە وشیاری لە بابەت بایەخەکان گەیشتووە و دەتوانێ شێوازی هەڵسوکەوت و ژیانی خۆی لەرووی ئەوانەوە دیاری بکا (لێرەدا جیاوازییەک لەگەڵ کانتدا خۆی نیشان دەدا، ئەویش ئەوەیە کە بەگوێرەی ئەم بۆچوونە هیچ چەشنە یاسایەکی موڕاڵی گشتی بوونی نییە. هەر تاکێک دەبێ بۆ خۆی بایەخەکانی خۆی دیاری بکا، واتە ئەوەی چ شتێک بۆ ئەو خاوەنی گرنگترین مانایە لە ژیاندا). نموونەیەک بۆ ئەم شێوازە واتە شێوازی موڕاڵ: بروتوس Brutus کە سیاسەتمەدارێکی رۆمی

بوو کورەکەی خۆی کوشت، چونکە شۆڕشی ساز کردبوو. ئەو بایەخەی لێرەدا بروتوس هەڵسوکەوتی پێ دەکا ئەوەیە کە وڵات لە منداڵ بایەخی زیاترە. لێرەدا کردەیەکی ئەقڵانی ئەنجام دراوە.

5. لە شێواز یاخود قۆناغی سێهەمدا هەندێ شتی ناعەقڵانی خۆیان بەدیار دەخەن، کە لێرەدا بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بە "بڕوای کوێرانە" بکەین. وەک دەزانین بڕوای کوێرانە دەتوانێ ببێتە هۆی پێشێلکردنی موراڵ و یاساکان. بۆ نموونە لە دەقە ئایینیەکاندا هاتووە کە ئیبراهیم ویستی ئیسحاقی کوڕی بکوژێ. گەر ئەم ویستەی ئیبراهیم لەگەڵ کردەی بروتوس بەراورد بکەین دەتوانین بڵێین کە کردەی ئیبراهیم لەرووی بڕواوە بوو و کردەی بروتوس لەرووی ئەرکەوە. لای ئیبراهیم خودا لە یاسا موراڵیەکان گرنگتر بوو. واتە گەر یاسا موراڵیەکان بکەینە پێوەر دەبینین کە کوشتنی ئیسحاق کردەیەکی ناپەسەند و دژە ئەخلاقیە. واتە قەتڵە و قەتڵیش دژی عەقڵە، بەڵام لە روانگەی مەزهەبییەوە ئەمە قوربانییەک بوو بۆ خودا و ئەو هەستەی کە ئیبراهیم بەرامبەر بە خودا لە خۆیدا هەستی پێدەکرد لە هەموو شتێکی دیکە بەلایەوە گرنگتر بوو.

6. مرۆ دەتوانێ خۆی لەجیاتی بروتوس دابنێ و لە کردەی وی تێبگا، بەڵام ناتوانێ لە کردەی

ئیبراهیم تێبگا. کردەی ئیبراهیم (یاخود شێوەی بیرکردنەوەی) کردەیەکی سوبژکتیڤییە کە مرۆ ناتوانێ تێیبگا، بەڵام ئەمە رێک ئەو شێوازە یاخود قۆناغەیە کە کیرکەگارد بە شێواز یاخود قۆناغی هەرە بەرز ناوی دەبا، چونکە لەم قۆناغەدایە کە مرۆ بە جیددیەتی تەواوەوەو، هاودڵانە و لەرووی سۆزەوە دەجوڵێتەوە. لێرەدا مرۆڤ لە وەفادارییەکی تەواودایە بەرامبەر بە خۆی.

7. بۆ کەسێکی ئەخلاقی (ئێتیکەر)، ئەرک گەورەترین بەهای هەیە و بۆ مرۆڤێکی مەزهەبی، خۆشەویستی.

8.کیرکەگارد بەتووندی لەژێر کاریگەریی هیگڵدا بوو، بەڵام لە تەمەنی بیستساڵیدا کاردانەوەیەکی تووندی نیشان دا بەرامبەر بەو مەیلەی لە فەلسەفەی هیگڵدا هەبوو. واتە بەرامبەر ئەو بیرە سیستەماتیکەی هەموو شتێکی لە چوارچێوەی دیاریکراودا دادەنا، بەڵام لە هەمووی زیاتر دژی ئەو مەیلەی هیگڵ راوەستا کە تاک واتە ئیندیڤیدی دەخستە ژێر دەسەڵاتی کۆمەڵگا یاخود دەوڵەتەوە. لای ئەو تاک گرنگترین بوو نەک سیستەم، کۆمەڵگا یاخود دەوڵەت.

9. لای فەیلەسووفە پێشووەکان، مرۆڤ بوون بریتی

بوو لەوەی مرۆڤ نموونەیەک لە نەوعی مرۆڤ یاخود مرۆڤایەتی بێت. ئەوان سەریان بەو دیاردانەوە قاڵ بوو کە لەنێوان هەموو مرۆڤەکاندا هاوبەش بوون، بەڵام لای کیرکەگارد مرۆڤ بوون بریتی بوو لەوەی مرۆ سەرقاڵی خۆی بێت. واتە بیرکردنەوە لە تاک و وشیاری وی سەبارەت بە بوونی خۆی. بە باوەڕی ئەو، بوون لە جەوهەر گرنگتر بوو.

10. گرنگترین پەیوەندی و دیاردەکان لە ژیانی تاکدا ئەو شتانەن کە لە تاکایەتییەوە سەرچاوە دەگرن. بۆ وێنە تەنیا تاکە کە بوونی هەیە، بیردەکاتەوەو هەڵدەبژێرێ. تەنیا تاکە کە کردە لە خۆی نیشان دەدات، باوەڕی هەیە بە خودا و پەیوەندی لەگەڵیدا هەیە.

11. کۆمەڵێک راستیی ئۆبژێکتیڤی هەن، بەڵام زۆربەیان ئاساییین و لە ئاستێکی ئەوتۆدا نین. راستی ئۆبژێکتیڤی بریتیە لە وێنایەک لە مێشکی مرۆڤدا کە لەگەڵ دیاردەیەکی دەرەکیدا هاوتەبان. راستیی سۆبژکتیڤی وێنایەکە لە دۆخ یاخود پەیوەندییەک کە مانایەکی گرنگی هەیە لای ئەو کەسەی خاوەنیەتی. کیرکەگارد لەم پەیوەندیەدا نموونەیەک دێنێتەوە: ئەگەر خودا بوونی هەبێ، بوونەکەی راستیەکی ئۆبژکتیڤیە، بەڵام بوونی خودا راستیەکی سۆبژکتیڤیە تا ئەو جێگای کە مانایەکی یەکجار گرنگی لای من

هەیە، جا چ خودا بوونێکی ئۆبژکتیڤی هەبێ یان نەیبێ. بە یارمەتی سۆزی بە پایان من دەتوانم ئەم ئۆبژە نادیارە بگرم.

12. بەپێچەوانەی راستیدە ئۆبژێکتیڤیەکان (بۆ نموونە ماتماتیک یان ئەو زانیاریانەی لە بابەت دنیای واقعەوە هەمانە) راستییە سۆبژێکتیڤیەکان لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤی دی بەپێی ئاستی گرنگیان دەگۆڕدرێن. هەر بۆیە ناتوانین بەشێوەیەکی ئاسایی لە راستییە سۆبژێکتیڤیەکان بگەین. واتە ئەم جۆرە راستیانە ناتوانین لەگەڵ کەسانی دیکە بەش بکەین. بۆ منداڵ خۆشەویستیی دایک و باوک راستیەکی سۆبژێکتیڤیە، جا چ پەیوەندی ئەو لەگەڵیانا راستیەکی ئۆبژێکتیڤی بێت یان نەبێت. منداڵەکە ناتوانێ کەسانی دیکە بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەم خۆشەویستیە بگەیەنێ، بەڵام دەتوانێ راستییە ئۆبژکتیڤیەکان راستەوخۆ بۆ کەسانی دیکە راگوێزێ.

# فەیلەسووفە بوونگەرا مۆدێرنەکان

13. ئەو جیاوازییە ئاساییەی کە فەیلەسووفەکانی پێشوو لەنێوان سوبیەکت و ئۆبیەکتدا دەیکەن، بوونگەراکان تێر ناکات. بەگوێرەی وان مرۆ چاوەدێر نییە، بەڵکو بەشداری لە جیهاندا دەکا. مرۆڤ بوونیکی

پاسیف نییه، بەڵکو ئەکتیڤ و چالاکە. ئاکامی رۆڵێکی وا ئەوەیە کە مرۆڤ بۆ خۆی ببێتە چێکەری جیهانی خۆی.
14. ئەوەی گرنگە لە جیهاندا پەیوەندی بە حەز و داواکانی تاکەوە هەیە، هەر بۆیە تایبەتمەندیی تاک و ئەو دۆخە هەنووکەییەی تێیدا دەژی، گرنگترینن. لای بوونگەراکان دابەشکردنی مرۆڤەکان بەپێی سیستەمی دیاریکراو و پێناسەی هەمیشەیی، ناتوانێ زانیاریەکی زۆرمـان سەبارەت بە مرۆ پێشکەش بکات.
15.ئەوەی مرۆ لە بوونەوەرەکانی دی جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە مرۆڤ سەبارەت بە بوون و مەرگی خۆی خاوەن وشیارییە. جا هەر ئەمەیە دەبێتە سەرچاوەی ترس و دڵەراوکێ و نائومێدی تێیدا، هەروەها هەر ئەمەیە کە بنەمای تێگەیشتنی وی لە خۆی وەک بوونێک لە جیهاندا دەرک پێک دێنێ. (کیرکەگارد).

16. وشـیـاری سـەبـارەت بـە بـوونـی خـۆ، دەبێتە هۆی ئەوەی کە لای بوونەوەری وشیار، دریژە و بەردەوامی |"بوون" ببێتە کێشەی سەرەکی. لێرەدا مرۆ دەکەوێتە ناو دەرفەتی هەڵبژاردنێکەوە کە تێیدا مرۆ بوونی خۆی بەگوێرەی ئەو بایەخانەوە دیاری دەکا کە لای ئەو گرنگترینن. جا گەر مرۆ نەتوانێ هەڵبژێرێ، دەکەوێتە دۆخێکەوە کە تێیدا بەرپرسیارە لە ئاست ئاکامەکانی. ئەو ئازادیەی کە تێیدا مرۆڤ

دەتوانێ بەگوێرەی بایەخەکانیەوە هەڵبژێرێ، دۆخێکە کە مرۆ ناتوانێ خۆی لێ دەرباز کا.

17. بۆ نموونە وشیاری سەبارەت بە گرنگیی هەڵبژاردن، دەبێتە هۆی ئەوە کە مرۆ زۆر زیاتر لە جاران هەست بە لاوازی و بێ دیفاعی خۆی لەبەرامبەر دنیای دەوروبەریدا بکا. ئەمە دەبێتە سەرچاوەی ترس، دڵەراوکێ، نائومێدی و ئازار. بەڵام لەهەمان کاتدا وەها حاڵەتگەلێکن کە دەبنە هۆی کرانەوەی چاو لە ئاست دیاردە گرنگەکانی بوون. ترسی زۆر ئاکامی ترسێکە کە سەبارەت بە بوون هەمانە، نەک ترس سەبارەت بە شتێکی دیاریکراو.

18. وشیارکردنەوەی کەسێک لە بابەت راستیەکانی بوونی (راستییە سۆبژێکتیڤیەکان - کیرکەگارد) کەسێکی دی دژوارە. سارتێر لەم پەیوەندیەدا باس لەوە دەکا کە وشیاری خۆی لە خۆیدا خاڵیە، واتە هیچی تێدا نییە. ئەوەی کە لەراستیدا بۆ ئێمە هەیە و ئێمە دەتوانین لە بابەتیەوە وشیار بین ئەو دیاردانەیە Fenomen کە "بوون" لێیانەوە خۆی نیشان دەدات. لەمەوە سارتێر بەو ئەنجامە دەگا

کە نە وشیاری بوونی هەیە و نە شت، بەڵکو تەنیا دیاردەکانن Fenomen کە هەن (بۆ ئێمە). شتەکان واتە جیهانی ئۆبژێکتیڤی سەرەتا لەو مانایەدا هەن کە بۆ من هەن، واتە لە پەیوەندی لەگەڵ جیهانی مندا، کاتێک من هەڵیدەبژێرم لەو پەیوەندیەدا کە پەیوەندی بە منەوە هەیە. ئەمە مرۆڤەکانی دیکەش دەگرێتەوە، کاتێک بۆ وێنە من دەمەوێ ببمە بەشێک لە جیهانی کەسێکی دی. بەم جۆرە ناکۆکی لەنێوان دوو مرۆڤ بۆ وێنە پیاو و ژنێکدا سەرهەڵدەدات.

## بەکورتی:

لەم بابەتەدا باسی سێ شێوازی بوون کرا: ستاتیکی، ئیتیکی و ئایینی. هەر کامیانیشمان بەم تایبەتمەندییانەوە پێناسە کرد: جیددیەتێکی روو لەزیاد بوون، هاودڵی و سۆز. هەروەها جەختیشمان لەسەر مرۆ کرد وەک تاک لەجیاتی بوونەوەرێکی گشتی. مرۆڤ سەرقاڵی خۆیەتی وەک بوونێک، هەروەها سەرقاڵی راستییە سۆبژێکتیڤیەکانە (واتە ئەو راستیانەی مانایان هەیە بۆ خاوەنەکانیان وەک بوونێک). راستییە سۆبژێکتیڤیەکان ناتوانرێ راستەوخۆ بۆ مرۆڤێکی دی بگوازرێنەوە. هەروەها سەبارەت بە بوونگەرا مۆدێرنەکان گوتمان کە ئەوان چیدی قایل بە جیاوازیی نێوان سوبژە و ئوبژە نین، بە تاکایەتی مرۆڤەوە سەرقاڵن، باس لە وشیاری مرۆ دەکەن سەبارەت بە بوونی خۆی و هەروەها لە کۆتاییدا دەرفەتی هەڵبژاردن لای

ئەوان پرسێکی یەکجار گرنگە.

## تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی تێگەیشتنی مارکس لە مێژوو. مەبەستی لە هێزی جوڵێنەری مێژوو، خەباتی چینایەتی و چەوساندنەوە بەتایبەت لە سیستەمی سەرمایەداریدا

1. تیۆری مارکس لە بابەت گەشەی مێژوو، هەم دەربڕی قۆناغەکانی مێژووەو هەم دەربڕی چۆنیەتی گەشەیەتی لە داهاتوودا، بەڵام گرنگترین شت لەم تیۆرەدا تیۆری جوڵێنەری مێژووە.

2. بەپێچەوانەی بیروبۆچوونی هیگڵ کە مارکس بەتووندی لەژێر سریمەیدا بوو، مارکس پێی وابوو

کە جۆری هێزی جوڵێنەری مێژوو لە مەتریالە. مەتریالیسمی مێژوویی مارکس یاخود "تێگەیشتنی مەتریالیستی لە مێژوو" باس لەوە دەکا کە هۆکارە مەتریالی و ئابووریەکان کە لە پەیوەندی لەگەڵ کار و بەرهەمهێناندان، هێزە سەرەکیەکانی جوڵە لە سروشت و مێژوودان.

3. مێژوو و کۆمەڵگا خاوەن بنەمای مەتریالین و ئەنجامی وزەی بەرهەمهێنەر، بەرهەمهێنان و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانن. وزەی بەرهەمهێنان بریتیە لە چاوگە سروشتیەکانی وەک ئاو، با، نەوت، هێزی مرۆڤ و زانیاری و ئەزموونەکانی، هەروەها ئامرازەکانی بەرهەمهێنان (وەک تکنۆلۆژی و کەرەسەکان). لەگەڵ بەکارهێنانی هێزە نوێیەکانی بەرهەمهێنان، پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان، بارودۆخی ژیانی مرۆ لە کۆمەڵگا، پەیوەندیی نێوان خاوەندار و کرێکاران، موچە خۆر و کاربەدەست، بەگشتی دۆخی چینایەتی گۆڕانی بەسەردا دێت.

4. لەسەر ئەم بنەما مەتریالییە (ژێرخان)، سەرخان دادەمەزرێ کە بریتیە لە ئایدیاکان، سیستەمی یاسایی، مۆراڵ، هونەر و ئایین. بەڵام ئەمانە بەرهەمی لاوەکیی پەیوەندییە مەتریالیەکانی بەرهەمهێنانن. سەرخان، شوێنی نواندنەوە و بەهێزکردنەوەی پەیوەندییە مەتریالیەکانی بەرهەمهێنان و ئابووریە. بۆ وێنە ئەم

رستەیە کە دەڵێ "دین تریاکی جەماوەرە" باس لەوە دەکا کە لە وەها دۆخێکدا دین دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵک رازیی بن بەو دۆخەی تێیدان و لەراستیدا ئارامیان دەکاتەوە و متمانەیان پێ دەبەخشێت. مارکس پێی وایە کە بوونی کۆمەڵایەتی دیاریکەری وشیاریی مرۆڤە.

5.هەروەک گوترا پێ بەپێی گەشە و بەرەوپێشچوونی وزەکانی بەرهەمهێنان، هەم پەیوەندیی کۆمەڵایەتی نوێ دەخوڵقێ و هەم دۆخی ژیان گۆڕانی بەسەردا دێت. ئەمە دەبێتە هۆی گۆڕانی کۆمەڵایەتی و شۆڕشی سیاسی لە دەورانە جۆربەجۆرەکاندا. مارکس لەم پەیوەندییەدا باس لە چوار دەوران دەکا:
1) دەورانی کۆیلایەتی. 2) فیئۆدالیزم (کە دەورانی کۆیلایەتی دەسرێتەوە). 3) دەورانی سەرمایەداری کە تێیدا فیئۆدالەکان سەروەریی ئابووریان لەدەست دەدەن. 4) سەرئەنجام دەورانی کۆمۆنیستی. هەڵبەت مارکس پێی وایە کە لەدوای رووخانی دەسەڵاتی سەرمایەداران بەهۆی شۆڕشی کرێکاری، بۆ ماوەیەک دیکتاتۆریی پڕۆلیتاریا دادەمەزرێ کە رێگا بۆ چێکردنی سیستەمی کۆمۆنیستی خۆش دەکا.

6) لە کۆمەڵگای کۆمۆنیستیدا دۆخی ژیان و دەسەڵات، جیاوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ جۆری کۆمەڵگاکانی پێش خۆیدا هەیە، چونکە چیدی چینەکان نامێنن

و ژێردەستە و باڵادەست مانای خۆیان لەدەست دەدەن.

7) لە سێ دەورانـی یەکەمدا، واتـە لە سیستەمی کۆیلایەتی، فیئۆدالیزم و سەرمایەداریدا هاودژییەکی بنەڕەتیانە لەنێوان چینە جۆربەجۆرەکاندا هەیە. ئەمە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی "خەباتی چینایەتی" کە زۆربەی کات بەشێوەیەکی نهێنی لەئارادایە، بەڵام جاروبار خۆی لە ململانێیەکی ئاشکراو و سەختیشدا نیشان دەدات.

8) خەباتی چینایەتی، شەڕێکە لەنێوان کرێکاران و ئەوانەی خاوەنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانن. لە سەردەمی کۆیلایەتیدا شەڕێکە لەنێوان کۆیلە و خاوەن کۆیلە، لە فیئۆدالیزمدا لەنێوان خاوەن زەوی و جووتیاردا و، لە سەرمایەداریشدا لەنێوان سەرمایەدار و کرێکاردا. تەنیا لە کۆمەڵگای کۆمۆنیستیدایە کە خەباتی چینایەتی مانای نامێنێ، چونکە ئامرازی بەرهەمهێنان لە خاوەندارێتی کۆمەڵگادایە.

9) لـە هـەر سێ سـەردەمـی پێش کۆمۆنیزمدا، کرێکاران لەلایەن چینی باڵادەستەوە تا ئەوپەڕی خۆی دەچەوسێندرێنەوە. هۆکارەکەیشی ئەوەیە کە ئەم چینە تەنیا ئابووریی لەژێر کۆنترۆڵدا نییە، بەڵکو دەسەڵاتیشی بەدەستەوەیە (یاسا و هێز). هەربۆیە

دەتوانێ کرێکاران ملکەچی ئەو دۆخەی بکا کە بۆ خۆی پێی خۆشە.

10) لەم سێ سەردەمەدا چەوساندنەوە بە رواڵەت بەشێوەی جۆراوجۆر، بەڵام لەهەمان کاتدا بە سێ شێوەی وەک یەک بەرێوە دەچێ: کرێکار ناچار دەکرێ کە زیاتر لەوەی کار بکا کە بۆ بەڕێوەبردنی خۆی و بنەماڵەکەی پێویستە. بایەخی ئەم کارە زیادیە (قازانج) دەچێتە گیرفانی خاوەنکارەوە. تەنیا شتێک کە ئەم سێ جۆر کۆمەڵگایە لە یەکتر جودا دەکاتەوە ئەو شێوازەیە کە کاری زیادی پێ دەسەپێندری بەسەر کرێکارەکەدا.

11) بۆ وێنە لە دوانزە سەعات کاری رۆژانە شەش سەعات کار بەسە بۆئەوەی کە کرێکارەکە ژیانی خۆی و بنەماڵەکەی پێ دابین بکا، بەڵام کرێکارەکە (لە سیستەمی کۆیلایەتیدا کۆیلە، لە فیئۆدالیزمدا جووتیار و لە سەرمایەداریدا کرێکار) لە هەر سێ کۆمەڵگاکەدا لە شەش سەعات زیاتر کار دەکات. ئەوان تەنیا حەقدەستی ئەم شەش سەعاتە وەردەگرن و ئەو شەش سەعاتەی دیکە دەچێتە گیرفانی خاوەن کارەکەوە (واتە کۆیلەدار، ئاغا و سەرمایەدار).

12) مارکسیزم دەیەوێ کۆتایی بە وەها سیستەمێک بێنێ، واتە سیستەمێک کە زۆربەی خەڵک بەرەو

هەژاری پاڵ پێوە دەنێ. ڕێگاچارەش لەوەدایە کە ئامرازەکانی بەرهەمهێنان ببێ بە موڵکی گشتی و ئەو قازانجەی بەرهەمی بەرهەمهێنانە وەک یەک بەسەر هاوڵاتیاندا دابەش بکرێ.

## تایبەتمەندییەکانی تیۆری گەشەی داروین (گەشەی ئارام) و ئاکامەکانی لەسەر مرۆڤ

1) هەتا سەرەتای سەدەی نۆزدە ئەم بیروباوەڕە زاڵ بوو کە جیاوازیی نێوان ڕووەک، ئاژەڵ و مرۆڤ جیاوازییەکی نەگۆڕە. واتە تایبەتمەندییەکانی هەر کام لەمانە لە بەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکی دیکە رادەگوێزرێ بەبێ هیچ چەشنە گۆڕانێک. ئایدیای ئەفلاتوونی و بۆچوونەکانی ئەرەستوو لە بابەت فۆڕمەوە لەسەر ئەم بنیاتە ڕۆنراون.

2) به سەرنج و خوێندنەوەی وردتری سروشت، بەتایبەت ئەو ئاڵوگۆڕە مەبەستدارانەی مرۆ لە ئاژەڵی دەستەمۆدا دەیکا، بە جوانی دەردەکەوێ کە ئاژەڵ دەتوانێ گۆڕانی بەسەردا بێت، ئەو گۆرانەی دەشێ ئارام روو بدات، بەڵام لەهەمان کاتدا لە مەودایەکی درێژخایەندا ببێتە هۆکاری گۆڕانی بنەڕەتی تێیدا. ئاکامی لێکۆڵینەوەکانی داروین ئەوە نیشان دەدەن (لە بەشی بێگل Beagle دا) کە لە رووەک و ئاژەڵدا گۆڕانکاریەک روودەدات کە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خۆگونجاندنی ئەو رووەک یان ئاژەڵە لەگەڵ سروشت و شوێنی ژیان و دەوروبەری.

3) گرنگترین بەرهەمی زانستیانەی داروین کتێبی "تیۆری گەشە" یە کە تێیدا باس لە هۆکارەکانی گۆڕانی ئارام هاتووە. داروین لەم کتێبەدا بەوردی باس لەم هۆکارانە دەکا. ئەو بۆ خۆی پێی وایە کە کلیلی ئەم تیۆرە خۆی لە تیۆری توماس ماڵتوسدا دەبینێتەوە کە تێیدا باس لەوە کراوە کە حەشیمەتی مرۆ زۆر خێراتر لە خۆراک گەشە دەکا و پەرە دەستێنێ. کە ئاکامی ئەمە دەبێتە هۆی شەڕێکی بەردەوام لەپێناوی بووندا. شەڕێک کە تێیدا زۆر کەس پێش ئەوەی بگەنە قۆناغی زاوزێ لەناودەچن. تەنیا ئەوانەی دەمێننەوە و درێژە بە ژیان دەدەن کە لە ئامرازی باشتر بەهرەمەندن.

4) رەوتێکی وا تایبەت بە هەموو سروشتە. لە

شەڕ لەپێناوی بووندا هەندێک تاک سەرکەوتن بەدەست دێنن، کە ئەمەش بەهۆی هەبوونی ئامراز و تایبەتمەندیی باشترەوەیە. ئەم ئامراز و تایبەتمەندییانە دەرفەتی خۆگونجاندن لەگەڵ شوێنی ژیان و دەوروبەر دەدەن. تەنیا ئەمانە دەتوانن زاوزێ بکەن و درێژە بە نەسڵی خۆیان بدەن. لێرەدا داروین کەڵک لە دەستەواژەی "هەڵبژاردنی سروشتیانە" وەردەگرێ. کە مەبەست لەم دەستەواژە ئەوەیە کە سروشت بۆ خۆی، ئەوانە بۆ درێژەدان بە ژیان و مانەوە هەڵدەبژێرێ کە خاوەن ئامرازی باشترن.

5) ئەم بۆچوونە لەسەر ئەو بنەمایە راوەستاوە کە جیاوازیی بچووک، بەڵام لەهەمان کاتدا گرنگ لەنێوان ئەندامانی جۆرێک لە ئاژەڵ یان رووەک لە باری میراتەوە هەیە. وەک دەردەکەوێ لێرەدا داروین لەگەڵ گۆڕانی کتوپڕی ژێنەکان واتە موتاسیۆن Mutasjon نامۆ بووە.

6) داروین پێی وایە کە ئاژەڵەکان لەراستیدا سەرەتا خاوەن فۆڕمێکی هاوبەش بوونە، کە دواتر لە پرۆسەیەکدا بەهۆی هەڵبژاردنی سروشتییەوە توانیویانە ئەم فۆڕمەی ئیستایان سەقامگیر بکەن. دەتوانین بڵێین کە ئاژەڵەکان هەموویان لە پەیوەندییەکی خزمایەتی لەگەڵ یەکتریدان. کلیلی تێگەیشتن لەوەی کە بۆچی ئەندامەکانیان لە یەکتر

دەچن دەگەڕێتەوە بۆ ڕەگەز و بنچینە، واتە ئەو خزمایەتییەی کە لە ژینەکاندا هەیانە.

7) بە بۆچوونی داروین مرۆڤی ئەم سەردەمە بەرهەمی گەشەی پلە بە پلەی فۆڕمەکانی پێشوتری خۆیەتی. شەمپانزە (کە مەیموون - مرۆڤێکە) و مرۆڤ دوو لکی بوونەوەرێکی هاوبەشن کە ئێستاکە لەناو چووە. بۆچوونی داروین لەمەڕ ڕەگەزی مەیموونانەی مرۆڤ، گەلێک هەڵوێستی توندوتیژی لێکەوتووەتەوە. دژبەران پێیان وایە کە وەها تیۆر و بۆچوونێک هەم بە دژی مەسیحیەتە و هەم لە بایەخی مرۆ کەم دەکاتەوە.

8) لە بابەت ڕەگ، بنچینە و بایەخی مرۆڤ، لایەنگرانی تیۆری گەشە لە ئاست دوو پرسیاردا لێک جودا دەبنەوە: ا) ئایا مرۆڤ و ئاژەڵەکانی دیکەی ئەم سەردەمە سەرەتایەکی هاوبەشیان هەیە؟ ب) ئایا جیاوازیی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ لە ئاستێکی وەهادایە کە مرۆڤ بەتەواوی لەوانی دی جیا بکاتەوە؟ ئەگەر وایە ئەم جیاوازیە خۆی لە چیدا دەبینێتەوە؟

9) ئەوەی کە بۆچی لە سروشتدا شەڕ لەپێناوی مانەوە ڕوو دەدا بۆ ڕادە و ئاستی خواردەمەنی دەگەڕێتەوە. ئەو خواردەمەنییەی لەبەردەست ئاژەڵە جۆربەجۆرەکاندایە، لە ئاستێکی وەهادا نییە کە بتوانێ بەشێوەیەکی سروشتی بەشی هەموو تاکەکانی سەر

بە جۆرێک لە ئاژەڵێکی تایبەت بکات، بۆیە شەڕیکی سروشتی لەنێوانیاندا روو دەدات و لەم شەڕەدا تەنیا ئەوانە دەیبەنەوە کە لە توانای باشتر بەهرەمەندن و دواتر دەتوانن لە رێگای زاوزێوە درێژە بە ژیانی نەوعی خۆیان بدەن و تایبەتمەندییەکانی خۆیان بۆ وەچەکانی داهاتوو رابگوێزن.

## تیۆر و خوێندنەوەی فرۆید لە بابەت مرۆڤ

1) پێش فرۆید، بیرورای زاڵ ئەوە بوو کە زەمیر و رۆحی مرۆڤ هەمان وشیاری مرۆڤە. بەگوێرەی ئەم بۆچوونە زەمیر دوو شتی دەگرتەوە: ا) کارتێکەریەکانی سەر هەست و هەستەکان (باسەکانی هیوم لەمەڕ سریمە). 2) وێنا و ماناکان (باسەکانی هیوم لە بابەت وێنا و ئایدیا). فرۆید بە باڵاخانەی وشیاری، قاتێک وەک ژێرخان زیاد دەکا و ناوی

دەنێ ناوشیاری. لە ناوشیاریدا حەجمێکی تێکترنجاو لە سریمە و هەستەکان هەن کە تەنیا بۆ ساتێک لە شکڵی وشیاریدا خۆیان دەردەخەن. ئەم حەجمە خۆی لە وشیاری جودا دەکاتەوە بۆ ئەوەی تەنیا وەک هەڵخڕێنەرو جوڵێنەری ڕۆح لە ناوشیاریدا بژیت. لەم ژێرخانەدا ئەم حەجمە بە شاراوەیی دەژی، بەڵام نەک بەشێوەیەکی لەبیرکراو. ئەم حەجمە بەردەوام هەوڵ دەدا کە بەرەو وشیاری بگەڕێتەوە، بەتایبەت کاتێک کەسەکە وشیار نییە و بۆ وێنە لە خەودایە.

2) ئەو هەست و ئەزموونانەی دەچەپێندرێنە ناو ناوشیارییەوە بریتین لەو حەز و بیرانەی کە ئازاراوی، ناخۆش، نائەخلاقین و جێی نامتمانەیین. واتە لەگەڵ ئەخلاقی ئەو کەسە و داوا ئەخلاقیەکان بەگشتی نایەنەوە. چەپێندراوەکانی ناو ڕۆح دواتر دەتوانن ببنە هۆی ترس، فشاری ڕۆحی، کوێری و ئیفلیجی. بۆ تیماری کەسێکی لەم چەشنە پێویستە کە چەپێندراوەکانی ناو ناوشیاری ئاشکرا بکرێن و چەندوچۆنیان دیاری بکرێن، بەشێوەیەک کە کەسی موبتەلا لە ئاستیان وشیار بێتەوە. لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم حاڵەتەدا فرۆید تیۆرێکی هێناوەتە گۆڕێ کە باس لە چۆنیەتی گەشەی ئاسایی و نۆڕماڵی کەسایەتی مرۆڤ دەکا. بەگوێرەی ئەم تیۆرە کەسایەتی مرۆڤ

بەشێوەی نۆڕماڵ ئاکامی سێ قۆناغە: ا) ئید یاخود غەریزە ب) ئێگۆ یاخود "مـن" . پ) سوپێر ئێگۆ. مرۆڤێکی بەختەوەر و سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە تێیدا هارمۆنی و هاوئاهەنگی لەنێوان ئەم سێ بەشەودا پێک هاتبێ.

3) هەر منداڵێکی تازە لەدایک بوو، وەحشێکی بچووکە تەیار بەهێزە سەرەتاییەکانی ژیان. کۆی ئەم هێزانە کە بە شوێن مورتاحبوونی خۆیانەوەن، "ئید" پێک دێنن. لە ئیددا پێش هەموو شتێک "لیبیدۆ" واتە هێزی سێکس دەبیندرێ کە حەز پاڵنەریەتی. هێزی سێکس بەهۆی خۆشەویستی، هەستی هاوسۆزی و لایەنگرییەوە مانای پێ دەبەخشرێ.

4) لەگەڵ گەورەبوون، منداڵ بەرەبەرە خۆی لە ئید دەرباز دەکا و سەرنجی بەرەو بوونی خۆی واتە ئێگۆ رادەکێشرێ. بەهۆی ئەوەوە کە ئێگۆ لەگەڵ پرینسیپەکانی جیهانی واقعدا سەروکاری هەیە، بۆیە دەکرێ بکەوێتە ململانێ لەگەڵ ئید. سەرنجی ئێگۆ بەرەو ئەو سۆزانە دەکشێ کە راستیەکان بۆی دادەنێن. ژیانێکی هارمۆنیک و هاوئاهەنگ پێویستی بەوەیە کە ئید بە شوێن بەدیهێنانی هەموو داواکارییەکانیەوە نەبێ.

5) پاش ئیگۆ، مرۆڤ لەگەڵ قۆناغی سوپێرئیگۆ بەرەوڕووویە. لەم قۆناغەدا منداڵ رووبەڕووی یاسا موراڵیەکان دەبێتەوە، واتە ئەو یاسایانەی نیشانەی هاوڕایی نێوان مرۆڤەکانە و هەر تاکێک دەبێ رەچاویان بکا بۆئەوەی لەلایەن بەرامبەرەوە قبووڵ بکرێ. سوپێرئیگۆ سەرەتا لەلایەن دایک و باوکەوە نوێنەرایەتی دەکرێ، بەڵام لەهەمان کاتدا وەک ویژدانی گشتی لەناو کۆمەڵگایشدا خۆی دەردەخا و دەبێتە سەرچاوە بۆ کەسایەتی.
6) ئەم سێ بەشە یەکتر چاوەدێری دەکەن، بەڵام دەبێ بگوترێ کە زۆربەی کات لەگەڵ یەکتر لە ململانێدان. ئیگۆ لەنێوان ئید و سوپێرئیگۆدا قەراری گرتووە، کە هەردووکیان رکەبەری ئەون و هەوڵ دەدەن بەسەریدا زاڵ بن. ئیگۆ بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدایە کە ئید و سوپێرئیگۆ بەسەریدا زاڵ نەبن. سەرکەوتنی سوپێرئیگۆ دەبێتە هۆی چەپاندن، ئازاری جەستە و رۆح. سەرکەوتنی ئیدیش دەبێتە هۆی رووخانی ئەو پردانەی ژیانی هاوبەشیان لەسەر بنیات نراوە. ئامانج ئەوەیە کە ژیانی رۆحی مرۆڤ لە هاوئاهەنگی و هارمۆنیدا بێت. مەبەستی فرۆید ئەوەیە کە مرۆڤ خاوەن سەلامەتیی رۆحی و دەروونی بێت.

"ئید" بەپێی پرینسیپی حەز، ئیگۆ بەهۆی پرینسیپی رئاڵ و سوپێر ئیگۆ بەگوێرەی پرینسیپی ویژدان دەجولێینەوە.

**ئازادیی کۆمەڵایەتی ژنان و بارابەریی سیاسیان. بۆچوونەکانی جان ستوارت میل، هاریەت تایلۆر، فێدریك ئێنگێلس و سیمۆن دوبوڤار لەم پەیوەندییەدا. لەمپەرە فەلسەفی و زانستیەکانی سەر رێگای ئازادی ژنان.**

1) وا چاکە سێ هۆکاری زەخت و زۆر لەسەر ژنان لە یەکتر جیا بکەینەوە: ا) هۆکاری سیاسی ـ کۆمەلایەتی کە بۆ وێنە لە سەردەمی یۆنانی کۆندا باو بوو. ب) هۆکاری بیۆلۆژی کە بۆ وێنە لە بیروبۆچوونەکانی

ئەرەستوودا هەیە. پ) وێنا ئایینیەکان کە لای توماس ئەکویناس دەبیندرێن.

سەبارەت بە هۆکاری سیاسی ـ کۆمەڵایەتی دەتوانین ئاماژە بکەین بە نەبوونی مافی سیاسی. بۆ وێنە دەبینین کە لە ئاتێنی یۆنانی کۆندا ژنان وەک پیاوان لە مافی هاوڵاتیبوون بەهرەمەند نەبوون و هەر بۆیە لە بڕیارە سیاسیەکاندا هیچ دەورو نەخشێکیان نەبوو. ژنان لە مافی خوێندن بەتایبەت لەو بوارانەدا کە پەیوەندیی راستەوخۆی بە زانیارییە سەرەتاییەکانەوە بوو، بەهرەمەند نەبوون، هەروەها لە مافی پەرە پێدانی بە کردەی پیشە بێبەری بوون. کچان هەر لە تەمەنی سیانزە تا شازدەساڵیەوە بە پیاوانی گەلێک بەتەمەنتر لە خۆیان بەشوو دەدران. ئەرکی ئەوان وەک هاوسەر تەنیا منداڵ بەخێوکردن و خانەداری بوو. ژنان لەراستیدا لە چوارچێوەیماڵدا یەخسیر کرابوون و زۆرجار بەهۆی زاوزێی زۆر و خراپی خۆراک هەر لە تەمەنی گەنجیەتیدا دەمردن.

2) هۆکاری بیۆلۆژیکی: بەپێی تیۆری ئەرەستوو چ لە جیهانی ئاژەڵان و چ لە جیهانی مرۆڤدا ئەوە نێرینەیە کە رۆڵی چالاکی دەگێڕێ و مێینەش پاسیف و وەرگرە. ئەرەستوو پێی وابوو کە ئەوە پیاو یاخود

نێرینەیە کە منداڵ دەخوڵقێنێ و ژن یاخود مێینە تەنیا ئەرکی راگرتن، بەخێوکردن و خەملاندنی لەئەستۆدایە. لە ترمینۆلۆژیی فەلسەفیی ئەرەستوودا نێرینە فۆڕمی بە تاک (منداڵ) دەبەخشێ و مێینە "تۆز".

3) وێنا ئایینیەکان: بەگوێرەی بۆچوونی توماس ئەکویناس داستانی خولّقاندن لە بابەت ژنەوە هۆکاری ژێردەستەبوونی ژنی روون کردووەتەوە. وەک دەزانین لە داستانی خولّقاندندا باس لەوە کراوە کە "خودا ژنی لە کەلەکەی پیاو خولّقاند"، نەک لەسەری. ئەمە بەڵگەیە بۆ رابەربوونی پیاو، بەڵام لەهەمان کاتدا نەگوتراوە کە ژن لە قاچی پیاو دروست کراوە. لەبەرئەوەی کە نەگوترێ پیاو مافی پێشێلکردنی ژنی هەیە.
4) "جان ستوارت میل" باوەڕی بە دابینکردنی مافی دەنگدان هەبوو بۆ هەموو گەورەکان. لە سەردەمی ئەودا ژنان کەمتر خۆیان لە قەرەی کێشەکانی کۆمەڵگا دەدا، هەر بۆیە ئەو پێی وابوو کە دابینکردنی مافی دەنگدان بۆ ژنان دەبێتە هۆی جولاندنی ژنان ۆ بەشداریکردنیان لە کاروباری کۆمەڵگاو لە سیاسەتدا.

5) باوکی جان ستوارت میل واتە جەیمز میل لە دژی ئەم بۆچوونە بوو و پێی وابوو کە ئەم ئەرکە لە ئەستۆی پیاوانە. جان ستوارت میل ڕەخنەی لەم بۆچوونە دەگرت و دەیگوت کە تاکەکان بۆ خۆیان باشتر دەتوانن پارێزگاری لە حەز و داواکانی خۆیان بکەن. هەڵبەت ئەمە منداڵان و ئەو کەسانە ناگرێتەوە کە پێویستیان بە سەرپەرشتیکردن هەیە. کەواتە ژنان نابێ بهێڵن کە پیاوان لەجیاتی ئەوان بڕیار بدەن.

6) لەبەرامبەر ئەو کەسانەیدا کە بەرگریان لە فرەژنی دەکرد و پێیان وابوو کە بەم شێوەیە ژن بەختەوەرترێکە، جان ستوارت میل دەیگوت کە ئەم جۆرە کەسانە چەوسێنەری ژن و منداڵەکانیانن. لە وەڵامی ئەم ڕستەیەشدا کە گوایا ژن بەشێوەیەکی سروشتی لە خزمەت ئەوی دیدایە، میل دەیگوت: سروشتی بوون پێش هەر شتێک بریتیە لە دەرفەتێک کە تێیدا ژنان بتوانن بەشێوەیەکی ئازادانە خۆیان بەرەوپێش بەرن. واتە دەرفەتی بەرامبەر و یەکسان لەگەڵ پیاوان.

7) مەبەست لە ئازادی ژنان ئەوە نییە کە ئیتر ژنان لە پەیوەندی و وابەستییدا نەبن، بەڵکو مەبەست ئەوەیە





کە ژنان بتوانن بەشێوەیەکی ئازادانە و بەپێی حەز و داواکانی خۆیان، ژیانیان چێ بکەن.

8)ئەنگڵس پێی وایە کە ژن لە بنەماڵەدادەچەوسێندرێتەوە. هەروەها پێی وایە کە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا ژن وەک ئامرازی بەرهەمهێنانە، پیاو دەیپارێزێ بۆئەوەی خزمەتی بکا. پیاو لە وەها کۆمەڵگایەکدا خاوەن دەسەڵاتی ئابووری و نانهێنەری ماڵە. ژنیش کرێکاری پیاوە و لەراستیدا کار دەکا لەپێناوی مانەوەو بەردەوامیی ژیانی لەناو بنەماڵەدا.

9) لە کۆمەڵگای کۆمۆنیستیدا چیدیکە ژن بەهۆی ئابووریەوە بە پیاو نابەسترێتەوە. چونکە ئەوە کۆمەڵگایە کە خاوەن ئامرازەکانی بەرهەمهێنانە و ژنانیش وەک پیاوان دەرفەتی ئەوەیان دەبێ کە لە کاروباری کۆمەڵایەتیدا بەشداری بکەن و سەهم و بەشی پێویستی خۆیان وەرگرن. لە وەها کۆمەڵگایەکدا بنەماڵە لەناودەچێ، چونکە چیدی نابێتە پەنا بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی ژن و منداڵ. لەراستیدا ئەوە کۆمەڵگایە کە ئەم ئەرکە راستەوخۆ لەئەستۆ دەگرێ و منداڵان لە باخچەی منداڵاندا پەروەردە دەکرێن.

10) "سیمون دوبوڤار" یش پێی وایە کە گەمەی دەسەڵات لەناو ژن و پیاودا هۆکاری مێژوویی هەیە، نەک سروشتی. واتە دەسەڵاتی پیاو لە سروشتەوە نایەت. لە گەمەی دەسەڵات لەنێوان ژن و پیاودا ژنان شەڕ دەکەن لەپێناوی بەرابەری و یەکسانیدا.